# ناوەرۆک

## پێشەکی

**نووسەر لە چەند دێرێك دا**

فرانز کافکا لە ساڵی 1883ی زایینیدا لە بنەماڵەیەکی بورژوای یەهوودی لە شاری پراگ لەدایك بوو. چونکە لەو سەردەمەدا جمهوری ''چك'' لەژێر دەسەڵاتی نەمسادا بووە زمانی ئاڵمانی وەك زمانی رەسمی بەکار هاتووە. هەر بۆیە بەشێکی زۆر لە خەڵکی ئەو شارە منداڵەکانیان دەنارده مەکتەبە ئاڵمانی زمانەکان. کافکاش لە یەکێك لەو مەکتەبانەدا ناونووس دەکرێ.

کافکا لە ساڵی 1901 چوو بۆ زانستگەو لە بەشی ماف دا دەستی کرد بە خوێندن. بەڵام هەر زوو زانستگەی بۆ ماوەی ساڵێك بەجێدێڵێ. پاش ئەم ساڵە دەگەڕێتەوە زانستگەو لە هەمان بەش دا درێژە بەخوێندن دەداو لە ساڵی 1906دا پلەی دکتۆرای ماف بەدەست دێنێ.

**بەرهەمەکانی:**

ئەوی پێویستە بگوترێ ئەوەیە زۆربەی بەرهەمەکانی کافکا پاش مەرگی بڵاو دەکرێنەوە. یەکەمین چالاکی کافکا لەبواری نووسین دا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1910، لەم ساڵەدا چەند بابەتێکی زمانەوانی دەنووسێ، هەروەها هێندێك نووسینی دیکەشی سەبارەت بە ئایینی مەسیحی هەبووە. هەر لەم ساڵەدایە کافکا دەفتەری بیرەوەری دادەنێو دەست دەکا بە یادداشت کردنی رووداوەکانی ژیانیو هەتا ساڵی 1920 ئەم کارەی درێژە دەدا. لەپاش ئەمانە لە ساڵی 1912 دا بەرهەمە ئەدەبییەکانی دەنووسێ. رۆمانی ''ئەمریکا'' لەم ساڵەدا نووسراوەو لە ساڵی 1927دا چاپ کراوە. چیرۆکی ''حوکم'' Le Verdict کە هەژدە لاپەڕە لەم ساڵەدا نووسراوە، هەر لەم ساڵەدا کورتە رۆمانی ''مسخ'' The Metamorphosis دەنووسێ. ئەم کورتە رۆمانە ساڵی 1915 چاپ دەکرێ کە یەکێکە لە باشترین بەرهەمەکانی ناوبراو.

لە ساڵی 1914دا رۆمانی ''محاکمە'' دەنووسێو ساڵی 1925 چاپ کراوە. کۆمەڵە چیرۆکی ''پزیشکی لادێ'' لەنێوان ساڵانی 1914-1917 نووسراوەو لە ساڵی 1919دا چاپ کراوە. ''تاقمی تاوانباران'' لەگەڵ چیرۆکی ''گراکوسی راوچی'' لەساڵی 1919دا چاپ کراون. رۆمانی ناتەواوی ''دیواری چین''یش هەر دەبێ لەم ساڵانەدا نووسرابێ کە ئەم چیرۆکانەی تێدا نووسراوە، بەڵام ئەم رۆمانە ساڵی 1931 بەچاپ گەیشتووە. رۆمانی ''قەسر''یش لەنێوان ساڵانی 1914-1922 نووسراوەو، ساڵی 1926 چاپ کراوە.

جیا لەم بەرهەمانە کۆمەڵەی ئەو نامانەی کە بۆ ''فلیسو ملینا'' ناردوونی کۆ کراونەوەو چاپ کراون. ئەم نامانەو بیرەوەرییەکانی گەلێك گرنگن بۆ تێگەیشتن لە بۆچوونەکانی کافکا.

کافکا لە ساڵی 1914دا ''فلیس باور'' Flice Bauer بە هاوسەری ژیانی دیاری دەکاو لە ساڵی 1917دا لێیجیا دەبێتەوە. پێوەندیی کافکاو جولی Julie Wohruzek بۆ ساڵانی 1919-1920 دەگەڕێتەوە. هەروەها پێوەندیی لەگەڵ ''ملینا'' Milena Jesenska-pollakش هەبووە. ''دۆرا'' Dora ئەو ژنەیە کە بۆ ماوەی ساڵێك 1923- 1924 لەکاتی مەرگی کافکادا ئاگاداری لێکردووە.

**نەخۆشی، وەسییەت و مەرگ**

کافکا لە ساڵی 1917دا تووشی نەخۆشی سیل دەبێ. ساڵی 1923 دەچێتە بیرلینو لە ساڵی 1924دا لە ئاسایشگای ''کیرلینگ'' لە نزیك شاری ویەن چرای تەمەنی دەکووژێتەوەو دەبرێتەوە پراگو لە گۆڕستانی یەهوودیان بەخاك دەسپێردرێ. هەروەك ئاماژە کرا زۆربەی بەرهەمەکانی کافکا پاش مەرگی بەچاپ دەگەن. کافکا لە وەسییەتەکەیدا بۆ تەنیا هاوڕێی نزیکی ''ماکس برود'' داوا دەکا هەموو بەرهەمەکانی، ئەوانەی بڵاویش بوونەوە، بسووتێنێ. بەڵام ماکس ئەم وەسییەتەی کافکا بەجێناگەیەنێو پاش مەرگی بەرەبەرە بەرهەمە چاپ نەکراوەکانی بەچاپ دەگەیەنێ. بەم جۆرە بەشێك لە باشترین ئەو بەرهەمە بەنرخە ئەدەبییانەی قەرار بوو لە کتێبخانەی ئەدەبی جیهانیدا ناوو جێگایان نەبێ لەنێو نەچوونو بۆ هەمیشە لەم خانەیەدا مانەوە.

**لەمەڕ ئەم وەرگێرانە**

ئەم کۆمەڵە چیرۆکەم لە زمانی فارسیەوە کرد بە کوردی. وەرگێڕی فارسی ''فرامرز بهزاد'' ئەم چیرۆکانەی لە زمانی ئاڵمانییەوە کردوون بە فارسی. من لە وەرگێڕانەوەی پێشەکی وەرگێڕی فارسی خۆم پاراست، چونکە ئەم پێشەکییەم بۆ وەرگێڕاوی

کوردی‌یەکە بە پێویست نەزانی، تەنیا چەند دێرێکم بە پێویست زانی بیانکەمەوە کوردی‌و بە دوو تێبینی دەیاننووسمەوەو تێبینی خۆشمی دەخەمەسەر:

یەکەم: دەڵێ ''لە چیرۆکەکانی پزیشکی لادێدا چیرۆکی لەبەر دەرگای یاسادا شیلەی رۆمانی محاکمەو چیرۆکی خەو نووسینێکی دیکە بۆ کۆتایی ئەم رۆمانەیە، هەروەها چیرۆکی پەیامی ئیمپراتۆری کرۆکی رۆمانی ناتەواوی دیواری چینە.''

دووهەم: دەڵێ، بۆ دڵنیا بوونی خوێنەران ئەوەش بڵێم، وەرگێڕ ئەوپەڕی هەوڵی خۆی داوە هەتا وەرگێڕانەکەی مووبەموو وردبێ، ئەگەر لە جێگەیەك دا رستەیەك ماناکەی دیار نەبوو، ئەو نادیاری مانایە وەئەستۆی نووسەرە نەك وەئەستۆی ئەو. ئەمانەش ئەو شتانەن کە دەبێ بە لێوردبوونەوەیەکی زۆرترەوە بخوێندرێنەوە.''

تێبینی خۆم: لە ئامادە کردنی ئەم پێشەکی‌یەدا یەك دوو وتارم بە زمانی فارسی دەست کەوت کە جیاوازی لە نووسین‌و دەرچوونی بڵاوکراوەکان دا هەبوو، هەروەها لە هیچ وتارێك دا تێکڕای کارو چالاکی‌یەکانی کافکام دەست نەکەوت. ئەوەی لێرەدا ساغم کردۆتەوە لە فەرهەنگی فەرەنسی- فەرەنسی PETIT ROBERT2 لەگەڵ ئەو یەك دوو وتارەی بە زمانی فارسی خوێندمنەوە ئامادەم کردوە.

منیش وەك ئەرکێکی سەرەکی وەرگێڕان هەوڵم دا ئەمانەت پارێزی بکەم. هەروەها هەوڵیشم دا زۆر لە دەقە فارسی‌یەکە دوور نەکەومەوە. هیوام وایە توانیبێتم لە کارەکەم دا سەرکەوتوو بووبم. ئەم وەرگێڕانە دەخەمە سەر باقی ئەو کارانەی کافکا کە کراون بە کوردی‌و پێشکەشی خوێنەرانی دەکەم.

## چەند دێڕێك

سەرەتای سەدەی بیستەم هاوکات بوو دەگەڵ پەرەسەندنی هەرچی زیاتری زانستو تێکنۆلۆژی. ئەرتەشی مودێرن، چەکی مودێرن، چەوسانەوە، شەڕی یەکەم، داگیر کردن، کوژرانی هەزاران هەزار کەس لە پانایی ئەم گۆی زەوییەدا، بەدبەختیو مالوێرانیو سووکایەتی،... ئەمانە دیاردەی نوێی پێشکەوتنو گەشەی کۆمەڵگە بوون. لەگەڵ ئەم ئازارو وەحشەتانەش دا مرۆڤ هەولی ئەوە بووە بەختەوەری بۆ خۆی بەدی بێنێ، ئەم میکانیزمە کۆمەڵایەتییە نوێیە مرۆڤی تێدا هەڵکەوتن ئەم سووکایەتیەیان پێتەحەممول نەکراو لە سەردەمەکەی خۆیان یاخی بوون. فرانز کافکا لەو مرۆڤە هاوچەرخانە بوو لە سەردەمەکەی خۆی وەرگەڕایەوەو بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە لە نائینسانی ئینسانەکانی دەوروبەری خۆی روانی.

هەلو مەرجی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی ئەو رووناکبیرەی تێدا دەژیا بەرهەمهێنی شێوەی بیرکردنەوەیەتی کە لە نووسراوەکانیدا رەنگدەداتەوە. نامۆیی، بێهوودەیی، دابڕان، ئەزموونی کولتووری مرۆڤی ئەو سەردەمەن؛ ئەمە لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبی کافکایە. ئەگەر دەیانگوت ئەدەبیاتی کافکا تاریكو لێڵە، ئەوە ئاسۆی لێڵو بێهیوای ئەو سەردەمە بوو، ئەو لێڵیو تاریکاییەی دروست کردبوو. ئەگەر کافکاو هاوچەرخەکانی لەلایەن خەڵکەوە نامۆ بوون، هۆیەکەی ئەو ڕێبازە ئەدەبییە نوێیە بوو کە لەسەر دەستی ئەو بیرمەندانە هاتبووە ئاراوە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبی نوێ لەهەر سەردەمێك دا ئەوەیە لێتێگەیشتنی ئاسان نیە. دۆخی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی پاش شەڕی یەکەم بوو بە هۆی هاندانێك بۆ گۆڕانی ئەدەبی. وەرچەرخان لە ئەدەب دا بەتایبەتی لە رۆمان دا رووی‌داو "پرۆست، فاکنەر، موزیل، جیمز جویز، کافکا..." پێشەنگی ئەم کاروانە بوون.

کافکا دەڵێ ئەوەی بیهەوێ لە نووسراوەکانم بگا، دەبێ ئاگای لە ژیانی تایبەتیم هەبێ. کەواتە بیرەوەرییو نامەکانی کلیلی لێتێگەیشتنیەتی. ئەم قسەیە ئەوە دەسەلمێنێ نووسەر ئەزموونەکانی ژیانی تایبەتی خۆی -واتا ئۆتۆبایۆگرافی autobiography- کردۆتە هەوێنی نووسراوەکانی کە لە ''مسخ''دا بە تەواوی دەردەکەوێ. کافکا هەر لە منداڵییەوە هەست بەو ستەمە دەکا باوکی بەرامبەری دەیکا. هەر بۆیە گۆشەگیریو بێدەنگی دەبنە تایبەتمەندی ئەو مرۆڤە. بەڵام ئەمە تەنیا شتێك نیە کافکای تووشی دابڕان کردووە.

کافکا کەوتۆتە نێوان پاڵەپەستۆی سێ کولتووری جیاوازەوە. یەهوودی، کە بە رەگەز یەهوودییە. سلاڤ، کە لەنێویان دا دەژی. ئاڵمانی، کە پێیدەنووسێ. بەڵام ئەو لەبان ئەو کولتوورانەوە بیردەکاتەوە. ئەم کولتوورانەو بەگشتی کولتووری سەردەم ناتوانن بیری کافکا داگیر بکەن، ئەو بەدوای ئینسانی دیکەو ئاسۆیتردا وێڵە هەر بۆیەشە هیچ کام لەو کولتوورانە لەکاتی خۆیدا وەرینەگرن.

توانایی ئەدەبی کافکا ئەو کاتە هەست پێدەکرێ کە پاش شەڕی یەکەم ''سارترو ئاندرێژید،...'' لە فەرەنسەوە بە ئاڵمانیەکانی دەناسێنن. کافکا بەم تایبەتمەندیانەوە کە لەم دۆخە کۆمەڵایەتیەدا سەریهەڵدا، لە شێوازو نووسین دا خاوەن ڕێبازی خۆیەتی کە گەلێ ئەدیب تەئسیریان لێوەرگرتوە. وابزانم خوێنەران زۆر تووشی وتەزای فەزای کافکایی، کارکتەری کافکایی، روحی کافکایی... بوون با بزانین ئەمانە کامانەن.

شاهۆ حەسەنپوور
2001/5/1
کۆیە - کەمپی ئازادی

# پارێزەری نوێ

پارێزەری نوێمان بۆ هاتووە: دوکتور بوکفالۆس * رواڵەتەکەی هێندێك ئینسان وەبیر سەردەمێك دێنێتەوە کەکابرا ئەسپی شەڕی ئەسکەندەری مەقدونی بووە. دیارە ئەگەر کەسێك ئاگای لە وردەکاری ڕووداوەکە بێ شتێکی لێ تێدەگا. سەرەڕای ئەوەش ئەم دواییانە لەسەر قادرمەی بەردەم بیناکە وەستاوم و چاوم لێیە پارێزەر رانەکانی هەڵدێنانەوەو بەو هەنگاوانەی بەسەر بەردە مەرمەڕەکانی ساڵۆنەکەدا دەینان دەنگدانەوەی وە ساڵۆنەکە خستبووو، قادرمەکانی یەك بەدوای یەك دا بەجێدەهێشتن. سپوورێکی ئاسایی مەحکەمەشم دیی چۆن نیگای وەدوو خستبوو و، وەك سەیرکەرانی پێش بڕکێکانی ئەسپ سواری بە نیگای چاوی پێی هەڵدەگووت.

هەرچۆنێکی بێ کۆمەڵەی پارێزەران بوکفالۆس وەردەگرن. بە چاوێکی کراوەو سەرسووڕهێنەرەوە دەڵێن بوکفالۆس لە نیزامی کۆمەڵایەتی ئەمڕۆدا جێگایەکی گەلێ گرنگی هەیە، هەروەها بەهۆی گرینگییەکەی لە مێژووی جیهان دا هەرچۆنێکی بێ شایانی ئەوەیە باوەشی بۆ بکەینەوە. ئەمڕۆ -حاشا لەوە ناکرێ- ئیتر ئەسکەندەرێکی گەورە لە گۆڕێ دا نیە. دیارە لە پیاوکوژیدا هێندێك کەس دەستێکی باڵایان هەیە؛ هەروەها کەم نین ئەوانەی شارەزاییەکی لەرادەبەدەریشیان لەوەدا هەیە لە پشتی مێزەکەیانەوە هاوڕێیەك بکەنە نیشانەی تیر؛ مەقدوونیەش بۆ هێندێك کەس وەها تەنگەبەر بۆتەوە کە لەعنەت لە فلیپ باوکی ئەسکەندەر دەکەن. بەڵام کەس ناتوانێ رێگەیەك بەرەو هیند نیشان بدا. تەنانەت لەو سەردەمەشدا دەست وێڕا گەیشتن بەدەروازەکانی هیند دژوار بووە. بەڵام شمشێری شاه رێگاکانی دیاریکردوە؛ ئەمڕۆ دەروازەکانیان بۆ شوێنی دیکە بۆ جێگای دوورەدەست و بەرزتریان بردوون. کەس رێگات پێنیشان نادا؛ زۆرن ئەوانەی شمشێریان بەدەستەوەیە؛ بەڵام تەنیا بەو مەبەستەی لە حەوادا بیسووڕێننەوەو، ئەو نیگایەی بیهەوێت وەدوایان بکەوێ پەرێشان دەبێ.

بەو پێیە لەوانەیە هەر بەڕاستی قازانجی کارەکە لەوەدابێ کە خۆمان وەك بوکفالۆس، لە کتێبەکانی قانوون دا نقووم بکەین. ئەویش ئازادو سەربەست، لاقی سواری لەتەنگەی توند نەکراوە، لەبەر رووناکی چراو لە بێدەنگیدا، بەدوور لە هەڵا هەڵای شەڕی ئەسکەندەر لاپەڕی کتێبە کۆنەکانمان دەخوێنێتەوەو، هەڵیان دەداتەوە.

---

* Bucephalus، ناوی ئەسپی ئەسکەندەرە.

# پزیشکی لادێ

زۆر شڵەژابووم: سەفەرێکی بە پەلەم بۆ دێهاتێك هەبوو کە دووری‌یەکەی 10 مایل دەبوو. نەخۆشێك لەگیانەڵادا چاوەڕێی دەکردم. بەفرێکی قورس مەودای نێوان منو ئەوی داگرتبوو؛ کالیسکەیەکی سووك و چەرخ گەورەم هەبوو، کە لەگەڵ جادەکانی ئێرە دەگونجا. پاڵتۆ چەرمییەکەم دەخۆوە پێچابوو و، جانتای کەلوپەلەکەنم بە دەستەوە بوو، ئامادەی سەفەر لە حەوشەدا وەستابووم. بەڵام ئەسپم نەبوو. ئەسپەکەی خۆم دوێشەو دوای هەولۆتەقەلایەکی زۆر لەم زستانە سارد وسەختەدا هەناسەی لێبڕابوو، کارەکەرەکەم لەنێو دێدا دەگەڕا بۆئەوەی بە ئەمانەت ئەسپێك وەربگرێ، بەڵام هیوایەك نەبوو، دەمزانی. لەکاتێك دا وردەوردە بەفر دای‌دەپۆشیم و هێزی جوڵانی لێ‌دەستاندم، لەبەر دەرگا کچەکە بەتەنیا کە لەنتەرێکی بەدەستەوە دەجوڵایەوە وەدەرکەوت. کێ بوو بەو شەوە ئەسپەکەی بە ئەمانەت دەدا؟ جارێکی دیکە درێژایی حەوشەم بڕی هیچ شتێکم بەدی نەکرد. سەرلێشێواو داماو شەقێکم لەدەرگا رزیوەکەی جێگای بەرازەکان دا کە ساڵانێك بوو بێکەڵك بوو بوو؛ دەرگاکە کرایەوەو، دووسێجار هات و چوو، هاڵاو و گەرمایەك کە لەهی ئەسپ دەچوو لە سەروچاوی دام. لەنێو تەویلەکەدا فانۆسێکی کز کە ترپەترپی دەکرد بە تەنافەکەوە هەڵواسرابوو، پیاوێك لەوێ هەڵتروشکابوو. جەستە گەورەو چاوە شینەکانی وەدەرکەوت لەکاتێك دا لەسەر چۆکان هاتەدەرێ، گوتی:"بیانبەستمەوە؟" نەم دەزانی چ بڵێم داهاتمەوە بزانم چی دیکە لە تەویلەکە دا هەیە.

کارەکەرەکەم لە لام وەستابوو، گوتی:"پیاو بۆخۆشی نازانێ لەماڵێ دا چی هەیە" هەردووکمان پێکەنین. وڵاغدارەکە هاواری کرد:"هۆبرا، هۆ خوشکە" هەر کەبانگی کردن دوو ئەسپی بەهێزو گەورە کە دەست ولاقیان کۆکردبۆوە، سەروگەردنە جوانەکانیان کۆ کردبۆوەو، تەنیا بە جووڵاندنی پاشوویان بە دەرگای تەویلەکەدا کە پڕاوپڕی بەوێ بوون هاتنەدەرێو لە جێگای خۆیان وەستان. هەڵمێکی گەرم لە پەیکەری ئەسپەکان هەڵدەستا. گوتم:"یارمەتی بدە، کچە زیتەڵەکە بە پەلە چوو بۆلای کابرای وڵاغدار هەتا قایشی کالیسکەکەی بداتە دەست، لەو کاتەدا کابرا پڕی پێدا دەکاو کچەکە لەئامێز دەگرێت و دەمی بەلاڕوومەتیەوە دەنێ. کچەکە هاوار دەکاو پەنام بۆ دێنێ. شوێنی چاڵی هەردوو ریزی ددانەکانی لەسەر کوڵمی دەبینم. "حەیوانی وەحشی دیارە ئیشتیای شەللاقت کردوە". بەڵام هەر زوو وەبیرم دێتەوە کەکابرا ناسیاو نیەو، نازانم لە کوێوە هاتوەو لەو کاتەدا کە خەڵك خۆم تێناگەیەنن بەهاوارمەوە هاتووە. وێ دەچێ نیگای خوێندبمەوەو هەڕەشەکەم بەدڵ ناگرێ و لەگەڵ ئەوەی دا کە خەریکی ئامادەکردنی ئەسپەکانە تەنیا جارێك رووم تێدەکا. دوایی دەڵێ:"فەرموون سوار بن". جێگای بڕوا نیە، هەموو شتێك ئامادەیە. هەست دەکەم هەتا ئێستا بە ئەسپی ئاوا جوان سەفەرم نەکردوە. لە کاتێك دا شاییم لە دڵدا دەگەڕێ سوار دەبم و دەڵێم:"بەڵام هەوسار بە دەستی منەوەیە ئێوە شارەزای رێگاکە نین." دەڵێ:"بەڵێ، بەڵام من لەگەڵ ئێوە نایەم و لە لای رۆزا دەمێنمەوە. رۆزا هاوار دەکاو دەڵێ:"نا" چونکە دەزانێ چی بەسەر دێ. هەڵدێتەوە ژووری. دەنگی زنجیری دەرگا کەلەپشتەوەوە پێیدا دەکاو پاشان ترنجانی قفڵەکەم بە گوێ دەگا. سەرەڕای ئەوەش چرای ساڵۆن و هەموو هۆدەکان یەك بە دوای یەك دا دەکوژێنێتەوە بۆ ئەوەی شوێنەونکەی کردبێ. بەکابرای وڵاغدار دەڵێم:"ئەتۆش دەبێ لەگەڵ من بێی، ئەگینا سەرەڕای پێویستی سەفەرەکە چاوپۆشی لە رۆیشتن دەکەم. تەنانەت ئەوەم بەبیردا نایە کە کچەکە لە بڕی ئەسپەکان بەجێ بێڵم." ئەو گوتی:"هەی ها" و چەپڵەیەکی لێدا؛

کالیسکەکە وەك تەلاشـەدارێك کـە بەسـەر سـێلاوێکی بـەخوڕ دا دەڕوا هەڵدەکەنـدرێ. گـوێم لـە دەنگـی قرچەقرچـی دەرگاکە دەبێ کابرا وەبەر شەقی دابوو؛ دوایی چاووگوێم پڕ دەبێ لە دەنگـی لوورەلـووری بـاو هـەر جـۆرە هەسـتێکم داگیر دەکا. ئەوەش ماوەیەکی کورت درێژە دەکێشێ، چوونکە دەڵێی ماڵی نەخۆشەکە بەرامبەر ماڵەکەمە. بـێ ئـەوەی بەخۆم بزانم دەگەمە جێگا، ئەسپەکانم ئارام ئارام وەستان، بەفر نابارێ و لێـی کردۆتـەوە. تریفـەی مانگەشـەو بـاڵی بەسـەر هـەموو شـوێنێك دا کێشـاوە. دایـك و بـاوکی نەخۆشـەکە بـە پرتـاو لـە مـاڵ دێنـەدەر و بـەدوای وانیشـدا خوشـکەکەی؛ بـە شـێوەیەك لـە کالیسـکەکەوە دەمبەنـە ژوورێ دەڵێـی لەسـەر دەسـتانیان دانـاوم، لـە قسـە تێکـەڵ پێکەڵەکانیان هیچم دەست ناکەوێ؛ هـەوای هـۆدەی نەخۆشـەکە بـۆ هەڵمـژین نابـێ. کوورەکـە دووکـەڵ دەکـا؛ دەبـێ پەنجەرەکان بکەمەوە؛ بەڵام ئەگەر لە پێشدا سەیری نەخۆشەکە بکەم باشترە. لاوێکی کزە بـە چـاوانی بێسـۆما؛ تـای لـێنیە. نە ساردەو نە گەرم. کراسی لەبەر نەکردوە؛ لـەژێر لێفەکـەی دێتـەدەرو دادەنیشـێ؛ پاشـان خـۆی بـە ملمـەوە هەڵدەواسێو بە گوێم دا دەچرپێنێ:"دوکتۆر گیان لێم گـەڕێ بـا بمـرم." سـەیری دەوروبـەر دەکـەم. کـەس گـوێی لـە قسـەکەی نـەبووە؛ دایـك و بـاوك بـێدەنگن و خۆیـان کڕوشـم کـردوە. چـاوەڕوانن بـزانن دەڵـێم چـی. خوشـکەکەی کورسـییەکی هێنـاوە ساکەکەمی لەسـەر رۆنـێم. ساکەکە دەکەمـەوەو لـەنێو کەرەسـەکاندا دەگـەڕێم. لاوەکـە لەسـەر تەختەکەیەوە زوو زوو دەستی درێژ دەکا بۆ ئەوەی داواکارییەکەم بیرخاتەوە، گازێك هـەڵدەگرم و لەبـەر رووناکـایی مۆم دا چاوی لـێدەکەم و دەیخەمەوە جێگای خۆی. لە دڵی خۆم دا دەڵێم:"بەڵێ، خواکان لـەکاتی وا دا فریـا دەکـەونو ئەسپێکت بۆ دەنێـرن و لەبـەر ئـەوە بەپەلـەی ئەسـپێکی دیکەشـت رەگـەڵ دەخـەن و ئـەو کاتـە بـە دانـی ولاغـدارێك خێرەکەیان لە سنوور تێدەپەڕێنن." هەر لەوکاتەدایە کە رۆزام بیر دەکەوێتەوە؛ دەبێ چی بکەم چۆن رزگاری بکەم؛ لەو رێگایـە دوورەوەو بـەو ئەسـپە سەرکێشانە چۆن لـەژێر چـنگی ئـەو کـابرا وەحشیە بیهێنمـەدەر؟ هەسـتم کـرد ئەسپەکان هەوسارەکانیان شل کردۆتەوە. نازانم چۆن بوو هەرکامەیان یەکەی پەنجەرەیەکی کردەوەو سـەریان دێننـە ژوور و بێگوێدان بە دەنگی ئەندامانی بنەماڵەکە نیگایان دەبڕنە نەخۆشەکە. دەڵێی داوام لـێدەکەن وەرێ کەوین، لە ولامیـان دا بـیر دەکەمـەوە:"هـەر ئێسـتا دەگەڕێمـەوە". سـەرەڕای ئـەوە ئیـزن دەدەمـە کچـە کـە پێیوایـە ئـەو سەرلێشێواویەم لەبەر گەرمای هۆدەکەیە پاڵتۆیەکەم لەبەر دانێ. پەرداخێك عـارەقی قامیشـی شـەکرم بـۆ تێدەکەن؛ پیرەپیاوەکە دەستێك لەسەر شانم دەدا. ئەو، ئەوخۆشەویستییە بەوەدەزانێ پێی وایە دیارییەکی بە نرخی پێشکەش کـردووم. چاوچـنۆکییەکەی دەمڕەنجێنـێ هـەر بۆیـە بـە جولانـدنی سـەر لـە خواردنـەوەی خـۆ دەپـارێزم. دایکـی لـە تەنیشت تەختەکە وەستاوەو بەو کارەی فریوم دەدا بەرەو تەختەکە بچم. بە قسەی دەکەم، هـەر کـەگوێ بـە سـینگی کوڕەکەوە دەنێم یەکێك لە ئەسپەکان لمبۆزی بەرەو میچی هۆدەکـە بـەرز دەکاتـەوەو دەحیلێنـێ. کـوڕە بێـز لـە ریشـە تەڕەکەم دەکا. ئەوەی لەوە پێشیش دەمزانی پەسند دەبێ: کـوڕە سـاغ و سـەلامەتە، بڕێـك سـوڕی خـوێنی بـاش نیـە. دایکە بەپەرۆشەکەی تێروپڕ قاوەی داوەتێ. بەڵام چ نیە، لە راستیدا دەبێ بە شەقێك لە جێگا بیهێنیـە دەرێ. بـەڵام من چیم بەم کارەداوە؟ من لە لایەن دەوڵەتەوە راسپێردراوم دوکتوری ئەم ناوچەیە بکـەم و هـەتا ئـەو جێگایـەی کـە پێشم کراوە زیاد لە پێویست کـارم کـردوەو بـە ئـەرکی سەرشـانی خـۆم زانیـوە کـە هـەردەم بـەهانای خەڵکـەوە بـێم. سەرەڕای ئەوەی کەمەعاشەکەم کەمە، دەستی هـەژارو فـەقیران دەگـرم. تـازە دەبـێ بـیر لـەحاڵی رۆزاش بکەمـەوە، بـا وادانێم حەق بە کوڕەیە باشە منیش دەمهەوێ بمرم، ئاخر من لەو زستانە دوورودرێژەدا خەریکی چیم؟ ئەسـپەکەم لە دەست دا. خەڵکی دیکەش ئەسپیان نەدامێ؛ هەربۆیە سەرم بەجێگای بەرازەکانم داکرد؛ ئەگەر بە رێکەوت ئەسپم دەست نەدەکەوت لەوانەبوو بە بەرازەکان کالیسکەکە راکێشم. بەڵێ ئەمەیە حاڵ وگوزەرانم. روو دەکەمـە ئەنـدامانی بنەماڵەکەو سەرم دەلەقێنم. ئاگایان لە هیچ نیەو ئەگەریش ئاگایـان لـێبا بڕوایـان نـەدەکرد. نووسـخە نووسـین زۆر سانایە؛ بەڵام لێك گەیشتن لەگەڵ خەڵك دا دژوارە؛ باشە چاوپێکەوتنەکەم لێرەدا کۆتایی پێدێ؛ دیسان بـە خـۆڕایی زەحمەتیان دام بەڵام بەوە راهاتووم؛ زەنگی دەرگاکە لەشەودا کەرەسەی خەڵکی ناوچەکەیە بۆ ئـازاردانم. بـەڵام ئـەوە کەئەو جارە دەبوو رۆزام لەدەست بچێ، ئەو کچە جوانەی ساڵیانێك بـێ ئـەوەی گـوێم پێدابـێ لـە ماڵەکەمـدا ژیـاوە ـ ئەوە ئیدی قوربانییەکی گەورەیە، منیش نەوەك بێحورمەتیم بەو بنەماڵەیە کردبێ دەبێ بەلێزانی و وردبینییەوە بە شێوەیەکی دیکە هەڵس و کەوت دەگـەڵ رووداوەکـەدا بکـەم. چـونکە ئەوانـە هەرچـەندە بـاش لەگـەڵم بجوڵێنـەوە، لەگەڵم دڵپاك بن ناتوانن رۆزام بۆ وەگێـڕن. هـەر لەوکاتـەدا، کاتـێ ساکەکەم دادەخـەم و ئامـاژە دەکـەم پاڵتۆکـەم بـۆ

بێنن، کاتێ دەڕوانمە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە کەلەدەوری یەکتر کۆبوونەوە، باوک بۆن بە عارەقی قامیشی شەکرەوە دەکا، دایك دەڵێی لێم هیوا بڕاو بووە ـ ئاخر ئەوخەلکە چ چاوەڕوانی‌یەکیان لە من هەیە؟ فرمێسك لە چاوانی لوزەوویان بەست و لێوەکانی دەگەزی، خوشکەکەی دەسرەیەکی خوێناوی بە دەستەوەیەو، رایدەوەشێنێ. دێمە سەر ئەو بڕوایە ئەگەر پێویست بێ تارادەیەك دان بەوەدابنێم کوڕەکە لەوانەیە بەڕاستی نەخۆش بێ. لێی نزیك دەبمەوە. بە بزەوە پێشوازیم لێدەکا؛ دەڵێی خۆشترین و بەتامترین خواردنی دنیام بۆ هێناوە. ئای ئێستا چ بکەم؟ هەردوو ئەسپەکە بەیەکەوە دەستیان بەحیلاندن کرد. ئەودەنگە کە بە فەرمانی لێپرسراوانی سەرەوە بەرێوە چووە بەنیازە کاری معاینەکە ئاسان بکاتەوە ـ و لێرە هەست پێدەکەم، بەڵێ، کوڕە نەخۆشەو لە راستیدا لەنێوقەدیدا برینێکی بە قەدرا لەپی دەست زاری لێك کردۆتەوەو، وە گوڵێك دەچێ کە سێبەری سەر پەڕەکانی هەتا بەرەو قوڵایی دەچێ تاریك و هەتا بەرەو داوێن دەکشێ ڕووناکتر دەبێ، لەختەخوێن لەسەر برینەکەن و برینەکە داقڵەشاوەو، وەك زارکی ئەشکەوت کراوەتەوە. ئەوە لەدوورەوە. لە نزیکەوە کارەساتەکە لەوە جەرگبڕترە، کێ هەیە بە بینینی ئەم دیمەنە سەرسام نەبێ. کرمی قاوەیی بە درێژی قامکە چکۆڵەم شەلاڵی خوێن لەنێو برینەکەدا پێچ دەخۆن و، بە سەرە سپی ولاقە بێئەژمارەکانیانەوە هەوڵ دەدەن بەرەو روناکی رێگە بدۆزنەوە. ئەی لاوی چارەڕەش کارت تەواوە. برینە گەورەکەتم دۆزیەوە، ئەو برینەی وەك گوڵ لەلاتەنیشتتە دەتخاو لەنێوت دەبا. کەس و کاری نەخۆشەکە کاتێ دەبینن خەریکی کارم لە خۆشیان لە پێستی خۆیاندا جێگەیان نابێتەوە. خوشك ئاماژە بەدایك و دایك بە باوك و باوك بەومیوانانەی لەسەرەخۆو بە ئەسپایی لە کاتێکدا باڵیان کردۆتەوەو هاوسەنگیان پێپاراستوە، بەبەر تریفەی مانگەشەودا دێنە ژووری، دەکا. لەکاتێکدا لاوەکە سەری بە هەنیسکەوە هەڵدەقەندرێ بە گوێمدا دەچرپێنێ:"رزگارم دەکەی؟" دیارە تووندی برینەکە هۆشی لێبریوە. خەڵکی ئەو ناوچەیەی من کاری لێدەکەم، هەموویان ئاوان. هەردەم چاوەڕوانی شتی نەکراویان لە دوکتورەکان هەیە. ئیمانی کۆنیان لە دەست داوە، قەشە لەماڵەوە دانیشتووەو عەباکانی رێوڕەسمی عیبادەت یەك لە دوای یەك ریشاڵ ریشاڵ دەکاو هەڵدەوەشێنێ. لە بەرامبەردا دەستە ناسکەکانی نەشتەرگەردەبێ هەموو شتێکیان لەدەست بێ. زۆر باشە با فەرمانی ئێوە بێ؛ بەلام ئەوەتان لەبیر نەچێ، من چ پێوەندی‌یەکم بەوکارەوەنیەو نەمووتەوە لەخۆم رادەبینم ئەوکارە بکەم. ئەگەر دەتان هەوێ لە بری قەشەیەك بۆ جێبەجێ کردنی کاروبارەکان کەڵکم لێوەرگرن، ئەوەش قبوڵ دەکەم. لەوە باشتر چیم دەوێ؟ من لەپزیشکی لادێ زیاتر هیچی تر نیم سەرەڕای ئەوەش لەئەمان دا نەماومەوەو کارەکەرەکەمیان بە دەسکەوت بردوە. لێرەیە ئەندامانی بنەماڵە و ردێن سپی‌یەکانی گەڕەك بەرەو من دێن و بەرگەکانم لەبەر دادەکەنن. تاقمێك لەقوتابی قوتابخانەکانو لەپێشەوەیاندا مامۆستاکەیان لەبەر دەرگا وەستاون و، ئاهەنگێك بەم دەقە دەخوێننەوە:

ڕووتی بکەنەوە بۆ ئەوەی دەرمانی بکا

ئەگەر دەرمانی نەکرد، بیکوژن

پزیشکێکی ڕووتەڵەیە، پزیشکێکی ڕووتەڵەیە

لیباسەکانیان لەبەر داناوم. لە کاتێك دا پەنجەکانم لەنێو ردێنم ناوەو، ملم خێچ کردوە سەیریان دەکەم.بە تەواوی لەسەرەخۆم و بە سەریاندا زاڵم. ئەگەرچی ئەو لەسەرەخۆیی‌یە کاریان تێناکا، لێم نزیك دەبنەوە دەست و لاقم دەگرن و هەڵم دەگرن، بۆ لای تەختی نەخۆشەکەم دەبەن، لە لای دیوار لە نزیکی برینەکە رام دەکێشن. پاشان هەموویان لەهۆدەکە وەدەر دەکەون و دەرگاکە گاڵ دەدەن. گۆرانیەکە تەواو دەبێ. هەور روخساری مانگ دادەپۆشێ؛ هەست بە گەرمی لێفەکە دەکەم؛ هەناسەی ئەسپەکان بە کەلێنی پەنجەرەکاندا دێتە ژووری وسێبەری سەریان لە تویی پەنجەرەکان دا دەجولێتەوە. گوێم لە ناڵەیەك دەبێ:"دەزانی چیە؟ باوەڕێکی ئەوتۆم بەتۆ نیە. چونکە تۆشیان هەر بەو شێوەی من بۆ ئێرە هەڵداو بە ویستی خۆت نەهاتی، لە بری ئەوەی یارمەتیم بدەی جێگای مەرگم پێ بەرتەسك دەکەی. پێم خۆشە ئێستا چاوەکانت بکۆڵم‌و دەریان هێنم." پێم گوت:"هەق بە تۆیە، ئابڕووچوونە. بەلام کاری من دوکتوریە. لەوە زیاتر چیم لە دەست دێ؟ ئاخر بۆخۆت دەزانی کارێکی ئاسان نیە." گوتی:"دەتهەوێ هەر بەوەندە رازیم بکەی‌و بڵێی چیم پێدەکرێ؟ هەمیشە دەبێ قانع بم. یان بەشی من هەر ئەوەیە." پێم گوت:"هاوڕێی لاوم هەڵەی تۆ لێرەدایە مەودای بیرکردنەوەت کەمە، هەتا ئێستاکە کون وکەلەبەری دنیا گەڕاوم زۆر نەخۆشیم بینیون، برینەکەی تۆ ئەوەندەش خراپ نیە کە بیری لێدەکەیەوە. بەقەد جێدەمی دووتەوری ئەولائەولا دەبێ.

هەن ئەو کەسانەی خۆ بەدەستەوە دەدەن هێشتا دەنگی تەوریان لەدارستان گوێ لـێنەبووە لـە تـرسـان هەڵدەلـەرزن. گوتی:"بەڕاستی وایە یان خەریکی فریوم دەدەی؟" لە ولام دا گـوتم:"گوێـت لـە بـەڵێنی پزیشـکێکی سـوێند خـواردوو دەبێ ئەو قسەیەی من بکە بە ئالقەو لە گوێی بکە" ئەویش بێدەنگ بوو. کاتی ئـەوە هـاتبوو لـەبیری خۆرزگـارکردن دابم. ئەسپەکان گوێرایەڵو بەوەفا لە جێگـەی خۆیـان وەسـتابوون. شـتوومەکەکانم لەچـاوتـروکانێك دا کۆدەکەمـەوە. نـەم دەویسـت بـە دەبـەرکردنی بەرگـەکان کـات بـەفیڕۆ بـدەم. ئـەو ئەسـپەی لەبـەر پەنجەرەکـە وەسـتابوو کشـایەوە گرمۆڵەی بەرگەکانم بەرەو کالیسکە فرێدا، پاڵتۆ چەرمییەکەم نەگەیشـتێو بـەقولاپێکی کالیسکەکەوەگیرسـایەوە. بـە تەکانێك خۆم فڕێدایە سەر کالیسکەکە، قایشەکانی ئەسپەکان بەسەر عـەردیدا دەخشـان. ئەسـپەکان لێـك جیـابوون، کالیسکەکە سـەرگەردان بەدوومانـدا دەهـات. پاڵتۆکـە لەپشـتەوەی هـەمووان بەسـەر بەفرەکـەدا دەهـات، دەئەسـپەکان راخوڕیم. جووڵەیەکی وایان نەکرد لەسـەرەخۆ وەك پیرەپیـاوان بـە سـارایەکی بەبـەفر داپۆشـراودا دەڕۆیشـتین هـەتا ماوەیەك گوێم لەدەنگی نوێ، بەلام بێواتای منداڵەکان دەبوو.

شاد بن نەخۆشەکان

پزیشکمان لە جێگەکەتاندا خەواندوە

ئاوەها قەت ناگەمـەوە ماڵـێ؛ عیـادە پـڕ لەداهاتەکـەم تێداچـوو، پزیشـکێکی دیکـە داگـیری دەکـا، بـەلام بێهوودەیـە چونکە ناتوانێ جێگەکەم پڕ بکاتەوە. ولاغدارەخوێڕیەکە لە ماڵەکەمـدا دەگوڕێنـێ:"رۆژا بۆتـە قوربـانی. نامهـەوێ بیر لە کۆتایی ئەو کارەسـاتە بکەمـەوە؛ رووتو قـووت لەبـەردەم سـەهۆڵبەندانی بـێخێرترین سـەردەم بـە کالیسـکەی عەردیو ئەسپە ئاسمانیەکان، منی پیرەمێرد سەرگەردانم؛ پاڵتۆکەم بەپشتی کالیسکەکەوە هەڵواسـراوە. بـەلام دەسـتم نایگاتێو هیچ کام لە خاوەنە خوێڕیەکانی نەخۆشەکان یارمەتیم نادەن. فریوم خوارد فریو. یەك جار بە پێشـوازی زایەڵـەی هەڵـەی زەنگـی دەرگـە چـووم. ئـەو هەڵەیـە قـەت قـەرەبوو ناکرێتـەوە.

# له ریزیکۆتاییدا

ئەگەر کچێکی جوانکیلەی باریکە، لە سیرك دا، بەسەر پشتی ئەسپێکی سستەوە لە ترسی راهێنەرە تورەو تۆسنەکەی کەدایمە قامچی بەدەستەوەیەو هەڵی دەسوڕێنێ، بەنێو ئاپۆرای خەڵك دا، بەخێرایی رۆژو مانگەکان بێوەستان، لەسەر سەکۆی سیرك لەسەرپشتی ئەسپەکەوە ماچی بۆ بینەرانی هەڵدەداو خۆی بادەداو ئەگەر ئەو شانۆیە لەنێو دەنگی مۆسیقای ئۆرکێستراو دەنگی پانکەکان هەتا ئاسۆی بێسنووری داهاتوو هەروا بەمات وکزی دەگەڵ کەروێشکەی چەپڵەی بینەران کە لە راستیدا حووکمی کوتکی ئاسنگەریان هەیە درێژەی دەکێشا، ئەو کاتە لەوانەیە بینەرێکی لاو لە ریزی کۆتاییەوە بە پەلە پلیکانە بێئەژمارەکانو نێوان سەندەڵییەکانی دەبڕیو خۆی دەگەیاندە پێشەوە. لەنێو هەرای شەیپوورەکانی ئۆرکێسترادا کە بە بەردەوامی ئاهەنگی تایبەتییان لێدەدا هاواری دەکرد:"بەسە!"

بەڵام چونکە شتەکە وا نیە، خانمێکی جوانکیلە کە کراسێکی سوورو سپی دەبەر دایە، بە نێوان ئەو پەردەیەدا کە خزمەتکارە لەخۆباییەکان بۆیهەڵدەدەنەوە، بە نەرمەباڵو بەفیزەوە دێتە نێو گۆڕەپانەکە، بەرێوەبەری سیرك لەکاتێك دا بەتەواوی تەسلیمی بووە، خوازیاری نیگایەتی و وەك سەگێکی وەفادار خۆی بادەداو، بەرەو پیری دێ. بە دڵسۆزییەوە دەڵێی بەزۆرییو بە ناچاری دەیهەوێ خۆشەویستەکەی بۆ سەفەرێکی پڕ لە مەترسی بنێرێ، کچە سواری ئەسپی هەوری دەکاو ناتوانێ بڕیار بدا قامچییەکە بەمەبەستی دەست پێکردن هەڵسووڕێنێ یان نا و سەرەنجام بەسەر خۆیدا زاڵ دەبێو دەنگی شریقەی قامچییەکە دێ. کابرا بە دەمێکیکراوەوە پێ بە پێی ئەسپەکە هەڵدێ؛ چاوە تیژەکانی وەدوای سوارەکە دەخاو لە لێزانیکچە سەرسام دەبێو بەزمانی ئینگلیزی بانگی دەکاو، لە مەترسییەکانی ئاگادار دەکاتەوە؛ بەتووڕەییەوە دەڕوانێتە ئەوکەسانەی ئاڵقە لاستیکەکانیان راگرتوەو تێیان دەگەیەنێ وریاو ئاگاداربن پێش ئەوەی دوایین تەقڵە کۆتایی لێدا کە پڕ لەمەترسییە، دەستەکانی هەڵدێنێو داوا دەکا ئۆرکێسترا کۆتایی پێدێ؛ سەرەنجام کچە نازدارو خۆشەویستەکەی لە ئامێز دەگرێو لە ئەسپەکەی دێنێتە خوارو، هەر دوو گۆنای ماچ دەکا. شادی، رێزلێنانو پێشوازی خەڵك ئەوەندە زۆرە بەڵام ئەو هەر بەکەمی دەزانێ. سوارەکەش کە پاڵی وێداوە نوقمی تەمومژ، بەدەستی کراوەوە، لەسەر نووکی پەنجە دەوەستێو سەرو پرچو گەردنە جوانەکەی بۆ پشتەوە دەبا. بەو کارەی دەیهەوێ هەموو بەشداران لە بەختەوەری خۆیدا بکاتە شەریك. ـ چونکە وایە، بینەری لاو کەلە ریزی کۆتاییەوە شۆڕ ببۆوە نێو خەڵکەکە رووەتی بە نەردەکەوە دەنێو، دەڵێی خەوێکی قورس دایگرتووە، بێ ئەوەی ئاگای لێبێ فرمێسك لە چاوانی دەباری.

# نووسراوەیەکی کۆن

وا وێدەچی بۆ بەرگری لەنیشتمانەکەمان کەمتەرخەمییەکی زۆر کراوە. هەتا ئێستاش گوێمان پێنەداوەو، دوای کاروکاسبی خۆمان کەوتووین. بەڵام ئەو رووداوانەی لەم دواییانە روویاندا نیگەرانی کردووین.

لەبەرامبەر کۆشکی ئیمپراتۆریدا کارگەیەکی پینەچییەتیم هەیە. لە کازیوەی بەیانیدا هێشتا دووکانەکەم نەکردۆتەوە هەموو ئەو کۆڵانانەی دێنەوەسەر رێگەی مەیدان پڕ لە چەکدار دەبینم. بەڵام ئەو چەکدارانە وەك سەربازی لای خۆمان ناچن و زۆرتر وە خێوەت نشینەکانی لای باکوور دەچن و کەس لە زمانیان تێناگاو تێگەیاندنیان گەلێك ناخۆشە. ئەو خێڵکیانە لەوێوە کە هەتا پایتەخت مەودایەکی دوورودرێژە تێکشاون و خۆیان گەیاندۆتە ئێرە. بە کورتی ئەوان ئێستاکە لێرەن و رۆژنیە ژمارەیەکیان پێوە زیاد نەبێ.

وەك راهاتوون و بە پێی سروشتیان لە کەش‌و هەوای ئازاددا بار دەخەن‌و خێوەت هەڵدەدەن، چونکە بێز لە بیناو خانوو دەکەن‌و پێیان خۆش نیە تێیدا بژین. زۆربەی کاتیان بە تیژکردنی خەنجەرو شمشێرو، غارغارێن بە ئەسپ دەبەنە سەر. ئەو گۆڕەپانە بێدەنگو هێمنەی بە ترس‌و لەرزەوە خاوێن‌و پاك رادەگیراو دەپارێزرا، وەك تەویلەیان لێکردوە. دیارە ئێمە زۆرتر هەوڵ دەدەین دەوروبەری دووکانەکانمان خاوێن بکەینەوە؛ بەڵام ئەوکارە بەخۆڕاییە، ئەو شەقامەیان وا پیس کردوە، فریا ناکەوین و سەرەڕای ئەوەش مەترسی ئەوە هەیە وەبن سمی ئەسپە وەحشی‌یەکان بکەوین یان سەروگوێمان بەر قامچی‌یەکانیان بکەوێ.

قسە کردن دەگەڵ ئەو خەڵکە ناکرێ. نە لەزمانی ئێمە تێدەگەن نە بۆخۆشیان زمانێکی تایبەتی‌یان هەیە. وەك قەلەرەشکە یەکتری تێدەگەیەنن. بۆیە دایمە لەو سەر رێگاو شەقامانە قیژەو زووقەیان دێ. لەبەر ئەوەی کولتوورو داب ونەریتی ئێمەیان لا سەیرە هەر بۆیە لە زمانی ئیشارەش تێناگەن. ئەگەر چەنەو باسکت لەبن را دەربێنی هەر تەقەی سەریان دێ. دیارە ناشیان هەوێ لێت تێبگەن. چاوو برۆیان هەڵدەتەکێنن وا هەست دەکەی خەریکە سپێنەی چاویان دەردەپەڕێ‌و دەمیان پڕ دەبێ لە کەف و دەیپرژێنن. بەم کارەشیان نە دەیانهەوێت شتێکیان وتبێ‌و نە مەبەستیشیان ترساندنی کەسە. ئەوان سروشتی‌یان وایە. زۆر بە ئازادیی‌و، سەربەستی دەژین. هەرچی پێیان خۆش بێ دەستی دەدەنێ‌و بە کەسیش ناڵێن؛ ناکرێ بڵێی بە زەبرو زەنگو بە زۆری ئەم کارانە دەکەن. دەست بۆ هەرچی بەرن خاوەنەکەی خۆ لادەداو هەرچی لێی بێ کابرا دەیانداتێ‌و ئەوانیش بێدڵی خۆیان ناکەن.

لە عەنباری کارگەکەم دا زۆر شتی بە کەلکیان وەچنگ کەوتوە، لە کاتی ئاوادا هیچ وەسەر خۆم ناهێنم، چونکە قەسابەکەی بەرامبەر دەبینم چ رۆژگارێکی هەیە بۆیە بە بەشی خۆم شوکرم. کابرای ماڵوێران ئێستا کەلاکەکەی هەڵنەواسیوە هەمووی پچڕ پچڕ دەکەن‌و هەر کەسە بەشی خۆی دەبا. ئەوانە ئەسپەکانیشیان گۆشت خۆرن. زۆرجار دەمدی سوارێك لەلای ئەسپەکەی بۆی کەوتوەو، هەر کامەیان لایەکی گۆشتەکەی بە دەمیەوە گرتوەو لێی دەپچڕن. قەسابەکە وا سەرسام دەبێ‌و لێیان دەترسێ ناوێرێ گۆشتیان نەداتێ‌و بەرگریان لێبکا. ئێمەش کە ئەو دیمەنە دەبینین پارە کۆدەکەینەوەو دەیدەین بە کابرای قەساب، چونکە ئەگەر گۆشتیان دەست نەکەوێ کەس نازانێ چی دەکەن. دیارە ئەگەریش هەموو رۆژێ گۆشتیان دەست بکەوێ نازانین ئاخرەکەی بە تەمای چین و چی دەکەن.

ئەوەی لەم دواییانەدا بە بیری قەساب داهات بە لایەنی کەمەوە ئەوەبوو قورسایی کوشتاری حەیوانەکان لەسەر شانی خۆی لاباو، هەر کە بەیانی داهات مانگایەکی زیندووی هێنایە دووکانەکەی ـ ئەو کارەی نابێ دووبارە بکاتەوەـ ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم کاتژمێریکی تەواو لە کارگەکەمدا لە ترسان خۆم لە ژێر لیباسو باڵنجو لێفەکاندا حەشار دابوو، تەنیا بۆ ئەوەی گوێم لە دەنگی بۆڕەبۆڕی مانگاکە نەبێ. ئەو خێوەت نشینانە لە هەموو لایەکەوە کەوتبوونە سەری‌و گۆشتی گەرمیان لێ‌دەپچڕی، ماوەیەکیش پێ‌چوو دەنگەدەنگەکە بڕابۆوە نەمدەوێرا بێمەدەرێ، ئەوان دەتگوت هەتا لێوان شەڕابیان خواردۆتەوە، سەرخۆش لە قەراخ پاشماوەی کەلاکی مانگاکە لێی کەوتبوون.

هەر لەو کاتەدابوو، ئیمپراتۆرم لە پشت یەکێك لە پەنجەرەکانی کۆشکەکەی بەرامبەردا بەدی کرد؛ ئەو رۆژەکانی دیکە قەت نەدەهاتە هۆدەکانی دەرەوەی کۆشکەکەو هەردەم لەنێوباخەکانی نێوەندی کۆشکەکەدا رۆژی بەسەر دەبرد. بەڵام ئەمڕۆ لە پشتی یەکێك لە پەنجەرەکانەوە وەستاوەو، دەیڕوانیە غەڵبەغەڵبی سەر شەقامەکە.

ئێمە هەموو ئەو پرسیارە ئاراستەی خۆمان دەکەین: سەرەنجام چ روودەدا؟ ئەو دەردو ئازارە هەتا کەی دەبێ تەحەممول بکەین؟ کۆشکی ئیمپراتۆری ئەوانەی گەیاندۆتە ئێرە بەڵام نازانن چۆن لە کۆڵ خۆیانیان بکەنەوە. دەروازەی کۆشکەکەیان لە پشتەوەوە گاڵ داوە. پێشتر حەرەسەکان بە فیزوخۆرانانەوە لە دەرووژووری کۆشکەکەدا دەسووڕانەوەو حەرەسیان دەدا. ئێستاکە لە پشتی پەنجەرەی بەمیل تەنراوەوە واوە نایەن. رزگار کردنی نیشتمانەکەمان خراوەتە سەرشانی ئێمەی کاسبکاران. بەڵام ئێمە بۆ کارێکی ئاوا دروست نەکراوین؛ قەتیش توانایی بەڕێوەبردنیمان نەبووە. لێك تێ‌نەگەیشتنێکیش لەگۆڕێ دایە، هەر ئەوەشە لەنێومان دەبا.

# لەبەر دەرگای یاسادا

لەبەر دەرگای یاسادا دەرگاوانێك وەستاوە. پیاوێکی دێهاتی لەودەرگاوانـە نزیـك دەبێتـەوەو، بـۆ جێبـەجێ کردنـی حاجەتێکی پێویست داوای چوونە ژوورەوە بـۆ بارەگـا دەکـا. لـە وەڵام دا دەرگـاوان پێـی دەڵـێ جـارێ ناتوانـێ ئیزنـی چوونە ژوورەوەی پێبدا. پیاوەکە دالغە دەیگرێ پاشان دەڵـێ کەواتـە پاشـان دەتـوانم ئیزنـی چوونەژوورەوەم هـەبێ. دەرگاوان دەڵێ:"دەکرێ، بەڵام ئێستاکە ناکرێ."

چونکە دەرگای یاسا وەك هەمیشە کراوەتەوەو، دەرگاوان بەر دەرگا بەردەداو دەچێتە قەراخ، پیاوەکە لەو دەرفەتـە کەلك وەردەگرێو دادێتەوە هەتا بەنێو کەلێنی دەرگای کراوەدا ژوورەوە ببینێ. کاتێ دەرگـاوان ئـەو دیمەنـە دەبینـێ، پێدەکەنێو دەڵـێ:"ئەگـەر لـەوەی دوودڵـی نـاتهێڵم بچیە ژوورو، زۆر حـەزت لـە چـوونە ژوورە هـەوڵ بـدە سـەرەڕای ئەوەی بەرگریم لێکردووی بچیتەژوور... بەڵام ئـەوە بزانـە مـن بێدەسـەڵاتترین دەرگـاوانی ئێـرەم. تـەلار بـە تـەلار لەبـەر هـەر دەرگایـەك دەرگـاوانێکی لێیـە. یـەك لەیـەکتری بەدەسـەڵاتتر، چرچـاوی دەرگـاوانی سـێهەم بـۆ منـیش تەحەموول ناکرێ".

پیاوە دێهاتی‌یەکە چاوەڕوانی گێرەوکێشەیەکی وای نەکردوە؛ بیر دەکاتەوە، بـۆ نابـێ یاسـا بـۆ هـەموو کـەس، و لـە هەر کاتێك دابـێ؟ بـەڵام ئێسـتا کـە وردتـر سـەیری دەرگـاوان کـە پاڵتۆیـەکی چـەرمی دەبەردایـە دەکـا، لووتـە درێـژو زلەکەی، ریشە رەشەکەی کە چڵچڵ هاتوەو درێژ بۆتەوە سەرنجی رادەکێشێ، هەربۆیە پێی باشترە جارێ چاوەڕوانی بکاو لەوێ بمێنێتەوە، هەتا ئیزنی چوونەژووری پێدەدرێ. دەرگـاوان کورسـیەك دەداتـە کـابرا لەبـەر دەرگـا لەسـەری دانیشێ، رۆژ دێنو دەڕۆنو حەوتو و مانگ و ساڵەکان تێپەڕ دەبن کابرای دێهاتی زۆر هـەوڵ دەدا ئیزنـی چوونەژوور وەرگرێو، بە داواکاریو، پاڕانەوەکانی دەرگاوان جاڕس و ماندوو دەکا. دەرگاوان جارجار پرسیاری لەسەر وڵاتەکەی و زۆر شـتی دیکـە لـێدەکا. بـەڵام ئـەو پرسـیارانە لـە بێتاقەتی‌یـەوە دەکـرێنو زۆرتـر لـە پرسـیاری ئاغاکـان دەچـن. هەرکاتێك دەرگاوان لە پرسـیار کـردن دەبێتـەوە بـە کـابرا دێهاتی‌یەکـە دەڵـێ ناتوانـێ ئیزنـی چوونە ژووری بـداتێ؛ پیاوەکە بۆ رێگاو سەفەرەکەی شـتی زۆری لەگـەڵ خـۆی هێنـاوە؛ کامـەیان بەنرخـە وەك بـەرتیل دەیداتـە دەرگـاوان. دەرگاوانیش ئەگەرچی هەموویان پەسند دەکا، بەڵام بە کابرای لادێیی دەڵێ:"تـەنیا بۆیـە لێـت وەردەگـرم بـۆ ئـەوەی پاشان پێت وانەبێ کەمتەرخەمیت کردبێ." دوایساڵانێکی زۆر پیاوەکە دەرگاوانەکە دەخاتـە ژێـر چـاوەدێری‌یەوەو، دەرگاوانـەکانی دیکـەی یاسـا لـەبیر دەکـاو، یەکـەمین دەرگـاوان بـە رێگـری خـۆی دەزانـێ. کـابرای بێدەسـەڵات جـوێن بەبەختی رەشی خۆی دەدا. ساڵەکانی یەکەم بەدەنگێکی بەرزو بێگوێدانە هـیچ شـتێك جـوێن دەدا، دواتـر کـە ئیـدی پیر بووە تەنیا لەژێر لێوانەوە ورێنـەی دەکـا؛ ئاکـارو کـردەوەی منداڵانـە دەبێتـەوە. ئـەو سـاڵانە بـە بـەردەوامی ئـەو کابرایە لەدەرگاوان ورد دەبێتەوەو تەنانەت کێچەکانی سەرئیخەی پـاڵتۆ چـەرمییەکەی دەرگـاوان دەناسـێو لـەوانیش داوا دەکاو دەپاڕێتەوە دەرگاوان لە هەڵوێستەکەی خۆی پەژیوان بکەنەوە. سـەرەنجام شـەوقی چاوەکانی کـابرا دامـاوە دێهاتی‌یەکە کز دەبێو ئەویش بەراستی نازانێ دەوروبەری تاریکە یان چاوەکانی تووشـی هەڵـەی دەکـەن. بـەڵام هـەر ئەو کاتە لەتاریکایی‌دا بەباشی هەستی بە تررووسکایی تیشکێکی نەبڕاوە دەکرد کەبەنێو دەرگای یاسادا دەدرەوشایەوە. کابرا تەمەنێکی ئەوتۆی نەماوەو، پێش مەرگی هـەموو ئەزموونـەکانی ئـەو مـاوە درێـژەی لـە زەینـدا بـە پرسـیارێك کۆتایی دەهات کەهەتا ئەوکاتە لە دەرگاوانی نـەکردبوو؛ ئامـاژەی بـۆ دەکـا، چـونکە ناتوانـێ جەسـتە وشـك بووەکـەی

راست بکاتەوە. دەرگاوان ناچارە بەتەواوی دابێتەوە؛ لەوماوەیەدا جیاوازی بالاٌیان هەرچۆنێکی بێ بە زیانی دێهاتیيەکە گۆڕاوە؛ دەرگاوان دەپرسێ:"ئێستا دەتهەوێ چیتر بزانی؟ بەڕاستی لە پرسیار کردن تێر نابی."

پیاوەکە دەڵێ:"بۆ خەڵك بۆ گەیشتن بە یاسا هەوڵ نادەن؟ ئەدی بۆچی دوایی ئەو هەموو ساڵانە جیا لە من کەس هەوڵی هاتنە ژوورەوەی نەدا؟"

دەرگاوان دەزانێ ئەمڕۆ سبەییەکی تەمەنی ماوە، بۆ ئەوەی بۆ دواجار دەنگی بگەیەنێتێ هاوار دەکا:"جگە لە تۆ کەس بەم دەرگایەدا نەیدەتوانی بچێتە ژوورێ، ئەو دەرگایە تەنیا تایبەت بە تۆ بوو و، ئێستا دەچم دایدەخەم".

# چەقەڵ و عەرەبەکان

لە سارا بارو بنەمان خستبوو. هاوڕێکان لە خەو دا بوون. عەرەبێکی ئازا کە عەبایەکی سپی لەبەر دابوو و، لە تاقەت کردنی وشترەکان دەگەڕایەوە، بە پەنام دا تێپەڕیو، چۆوە خێوەتەکەی بۆ ئەوەی بخەوێ.

لەسەر پشت لە سەر گیا جێگام خۆش کردبوو بە تامابووم بخەوم؛ خەوم لێنەدەکەوت. دەنگی لوورەی چەقەڵێك لە دوورەوە دەهات. دانیشتمەوە. ئەو دەنگانەی لەدوورەوە دەهاتن نزیك بووبوونەوە. بەخۆم نەزانی چەقەڵەکان ڕژابوونە ئەو نێوەو چواردەورەیان تەنیبووم. ئەو چاوە فۆسفۆریانەی هەڵدەبوونو دەکوژانەوە؛ ئەو جەستە باریکانەی دەتگووت بە زەبری قامچی چاپوك و هاوئاهەنگ دەبوون بە بەر چاوانم دا دەهاتنو دەچوون.

چەقەڵێکیان لە پشتەوەڕا لێم نزیك بۆوەو بە پرتاو بەلای دەستم دا تێپەڕی، وا خۆی ڕێخشاندم دەتگوت پێویستی بەگەرمای لەشمە، پاشان هاتە بەرامبەرم، چاوی لە چاوانەوە بڕیمو گوتی:"من پیرترین چەقەڵی هەموو ئەو ناوچەیەم، شادمانم لەوەی پێش ڕۆیشتنت ئەو هەلەم دەست کەوتو توانیم چاوم پێتان بکەوێ. چی وای نەمابوو هیوابڕاو بین ئاخر ئێمە ساڵانێکە چاوەڕوانی هەلێکی واین. دایکم چاوەڕێی دەکردی، هەروەها دایکی دایکم و، هەموو ئەو دایکانەی پێش لەوی ژیاون هەتا دەگاتە دایکی هەموو چەقەڵەکان. بڕوا بکەن."

ئەو قسانەی پیرەچەقەڵ تاساندمیو لەبیرم کرد ئەو دارانەی وەسەریەك نرابوون ئاور دەم هەتا بە دووکەڵەکەی چەقەڵەکان راوبنێم، پێم گوت:"پێم سەیرە گوێم لەم قسانە دەبێ من بە هەڵکەوت لە باکووری دوورەوە هاتوومە ئێرەو ڕێبوارم پێم بڵێ بزانم چیتان دەوێ؟"

دەتگوت ئەو پرسیارەی لێم کردن لە ڕادەبەدەر دڵسۆزانە بوو، هانم دابن، بۆیە ئەو بازنەی بەدەوریانـدا کێشابووم چاکتر دەیانگووشیو، زمانیان دەرکێشابوو و، زووزوو هەناسەیان هەڵدەکێشا.

پیرە چەقەڵ دوا:"ئێمە دەزانین لە باکوورەوە هاتوون. هیوای ئێمەش هەر ئەمە بوو. ئێوە باکووریەکان شعوورتان هەیە، کە عەرەبەکان لێی بێبەرین، سەرەڕای ئەوەش دەزانی زۆر خۆبەزل زانن؟ تەنانەت بڕە شعوورێکیان تێدا نیە. ئەو عەرەبانە بۆ ئەوەی ورگیان پڕ بکەن حەیوانی بەستەزمان دەکوژنو، لە لاشەکەشی بێزارن." پێم وت:"زۆر دەنگت هەڵمەهێنە چواردەورمان عەرەبی لێیە با وەخەبەر نەیەن." چەقەڵ گوتی:"بەڕاستی دیارە غەریبیو خەڵکی ئەم ناوە نی، دەنا دەتزانی لە هەموو مێژووی جیهاندا هەتا ئێستاکە نەبووە چەقەڵێك لە عەرەب بترسێ. لێیان بترسێین؟ هەرئەوەندە چارەڕەشیو ماڵوێرانیيە بەس نیە، ئێمەیان خستۆتە نێو ئەم قەومەوە؟"

گوتم:"لەوانەیە، لەوانەیە. بەلام من ئیزن بەخۆم نادەم باسی شتێ بکەم لە سنووری زانیاری من دا نیە. ئەوە دەبێ کێشەیەکی کۆن بێو چۆتە نێو دەمارو خوێنتانەوە، هەر بە خوێنیش کۆتایی دێ."

پیرە چەقەڵ گوتی:"ئەتۆ زۆر ژیرو تێگەیشتووی." چەقەڵەکان بێ ئەوەی جووڵە بکەن زمانیان دەرکێشابوو و وەهانکەهانك کەوتبوون، بۆدرنێکی ناخۆش کە تەنیا بە دەم گرتن پێشی پێدەگیرا لە هەناویان دەهاتەدەر. "ئەتۆ زۆر ژیری، ئەوەی وتت لەگەڵ ئامۆژگاریو وتەی بابو باپیرانمان یەك دەگرێتەوە، کەواتە خوێنیان دەڕێژینو کۆتایی بەو شەڕە دەهێنین."

پێم گوت:"ئای" زۆر لەوەی گەرم و گوڕتر کە دەمویست: "ئەوان بەرگری لەخۆیان دەکەنو، بە تفەنگەکانیان مێگەل مێگەل دەتانکوژن."

گوتی:"خراپ له مەبەستم دەگەی، ئەمە وەك سروشتی ئینسانەكانە وادیارە لە باكووری دووریش هەر ئەوەیەو لەنێو ناچێ. ئەگەر ئەو كارە بكەین رووباری "نیل"یش بەشی پاك بوونەوەی ئەو پەڵە پڕ لە شەرمو شوورەیی‌یەمان ناكا. ئەگەر بە زیندوویی چاومان پێیان بكەوێ رادەكەین. هەر شوێنێكی ئەوان پێیان تێنابێ ئاو و هەوایەكەشی بۆ هەڵمژین نابێو، بۆ شوێنێك دەڕۆین ئاوو هەوای پاك بێ، هەربۆیە هاتوینە ساراو، كردوومانەتە شوێنی ژیانمان."

لەو نێوەدا ژمارەیەكی دیكەش چەقەڵ گەیشتبوونە چواردەورەم. سەریان بەنێو دەستەكانیاندا شۆڕ كردبۆوەو، پەنجەكانیان دەلێستەوە. بە بینینی ئەو دیمەنە وام هەست دەكرد بەم شێوەیە دەیانەویست نەفرەتەكەیان بشارنەوە. نەفرەتێك ئەوەندە ترسێنەر بوو، دەمویست هەرچی زووتر خۆ لەو بازنەیەی بە دەوریان دا كێشابووم رزگار بكەم.

پرسیارم كرد:"كەواتە مەبەستتان چی‌یە؟" ویستم هەڵستم بەڵام نەمتوانی، دووچەقەڵی لاو لە پشتەوەڕا ددانیان بە كۆتو كراسەكەم دا بردبووە خوارێو، توند گرتبوویانم؛ ناچار دانیشتمەوە، پیرە چەقەڵ گوتی:"ئەوان داوێنیان گرتووی، ئەوەش تەنیا لەبەر رێزو حورمەتی تۆیە."

لە كاتێك دا وردە وردە رووم لە چەقەڵی پیرو چەقەڵە لاوەكان كرد هاوارم كرد:"پێیان بڵێ بەرم دەن!" پیری چەقەڵەكان گوتی:"ئەگەر بتهەوێ بەرت دەدەن. بەڵام هێندێكی پێدەچێ. بە پێی نەریت ددانەكانیان هەتا بن بردۆتە خوارو رێگایەكی دیكەیان نیە جگە لەوەی وردەوردە ددانەكانیان بێننەوەدەر تۆش لەونێوەدا گوێ بۆ داواكاری‌یەكانم بگرە." پێم وت:"ئەوەندە هەڵسو كەوتتانم بە دڵ نەبووە." وتی:"تۆ نابێ لەهەڵسو كەوتی دوور لەئەدەبو نەزانانەی ئێمە گلەیی بكەی." و لێرەدا بۆ یەكەمجار لە نالەی دەنگە سرووشتی‌یەكەی كەڵكی وەرگرت"ئێمە حەیوانی بێچارەین، تەنیا ئەو ددانانەمان بۆ كاری چاكو خراپ هەن، تەنیا ئەو ددانانە فریای ئێمە دەكەون." لە كاتێك دا بڕێك هێور بووبوومەوە، پرسیم:"باشە چیتان دەوێ؟"

بە دەنگێكی بەرز گوتی:"خواوەندی گەورە"، چەقەڵەكان تێكڕا لوورانديان. وام هەست كرد لە دوورترین شوێنەكان گوێم لە دەنگێك بووبێ، "خواوەندی گەورە، دەمانهەوێ كۆتایی بەم شەڕە بێنی، جیهانی كردۆتە دوو كەرتەوە. باب و باپیرانمان ئەو كەسەی قۆڵی هیمەتی لەم كارە هەڵدەكا بەم جۆرە وەسف كردوە كە ئێوەن كۆتایی بەم شەڕە دێنن. دەمانهەوێ لە چنگی ئەو عەرەبانە لە ئاماندا بین، بە ئازادی بژین؛ هەتا چاو هەتەر دەكا لێیان دوور بین، گوێمان لەنالەی ئەو مەڕە نەبێ چەقۆی عەرەبان ملی دووقاش دەكا؛ گیانلەبەرەكان دەبێ بە مردنی خۆیان بمرن. دەمانهەوێ هەموو خوێنی لەشیان بمژینو ئێسقانەكانیان بكرۆسینەوە؛ پاكیو خاوێنی هیوای ئێمەیە." چەقەڵەكان لێكڕا لە پڕمەی گریانیان دا."ئاخر تۆ چلۆن دەتوانی لەنێو دنیایەكی ئاوادا بژی ئەی دڵی هێژا ئەی دەروونی شیرن؟ سپیان پیسە؛ رەشیان پیسە؛ ردێنیان هێمای خۆفە؛ كەسەیری گۆشەی چاویان دەكەی هێڵنج دەدەی و، تف دەكەیتەوە؛ كاتێ دەستیان بەرز دەكەنەوە تاریكی دۆزەخ لە بن باڵیان دا دەبینی. ئێستاش ئەی خوایمەزنو بە توانا قۆڵی هیممەت هەڵماڵەو بەو مەقەستە ملیان هەڵبڕە." بە فرمانی سەری چەقەڵی پیر، یەكێك لە چەقەڵەكان مەقەستێكی چكۆلەی ژەنگاوی بە ددانی گرتبوو، هاتە پێش."

لە ناكاو هاوارێك هەستا. ئەو دەنگە دەنگی سەرقافڵەی كاروانی عەرەبەكان بوو، عەرەبەكان بە پێچەوانەی هاتنی بایەكی توند كەدەهات لێمان نزیك بووبوونەوە، سەرقافڵەكە لە كاتێكدا قامچی‌یەكەی رادەوەشاندو، شریقەی قامچی‌یەكە دەهات گوتی:"ئەوەش مەقەست كە لەمێژ بوو بەدوایدا دەگەڕاین! تەواو، چەقەڵەكان لە چاوتروكانێكدا بڵاوەیان لێكرد؛ بەڵام لە مەودایەكی دیاریكراودا وەستان؛ لێك كۆبوونەوەو پاڵیان وێك دا. وەك پەرژینێكی نەوی قەراخ گۆماوێكی بۆگەن دەچوون كە بە ڕیز چڕا بە پەرژینەكەوە هەڵواسرابوو؛ چاویان ورشەورشی دەكرد.

سەرەوەری من گوێبیستی ئەو قسانە بوویت. هەتا ئەو جێگایەی لە سنووری ئەدەبی قەومەكەیاندا بوو قاقایەكی بڵێندی لێدا.

لێم پرسی:"كەواتە تۆش دەزانی ئەمانە چیان دەوێ؟" وتی:"بێشك گەورەم هەموو كەس دەزانێ، هەتا عەرەبێك لە سارادا هەبێ ئەو موقەستەش لە سارا دا دەگەڕێ. هەتا دنیا دنیایە هەر ئاواش دەبێ." ئەوانە هەر ئوروو‌پایی‌یەك بێرەدا تێپەڕێ ئەم مەقەستەی بۆ جێبەجێ كردنی كاری گەورە بۆ دێنن؛ ئورووپایی‌یەكان لای ئەمانە گەورەن.

هیوای ئەو حەیوانانە بێهوودەیە؛ ئەوان شێتن شێتێکی تەواو؛ ئێمەش هەربۆیە خۆشمان دەوێن، ئەمانە لە جێگای سەگەکانی ئێمەن و بگرە خۆشەویستتریشن. ئێستا سەیرکە یەکێك لە وشترەکان کە ئەمشەو سەقەت بووە دەیهێننە ئێرە."

چوار باربەر هاتن و کەلاکی وشترێکیان دانا. هێشتا دایان نەنابوو دەنگی چەقەڵەکان هات، دەتگوت زنجیر کراون یەکەیەکە بێ ویستو ئیرادەی خۆیان جارجار دەوەستان و لەسەر زگ بەرەو ئێمە دەهاتن، عەرەبەکانیان لەبیر کردبوو، رق و بێزارییەکەیان لەبیر کردبوو. بۆنی کەلاکەکە ئەفسوونی کردبوونو هیچ بۆنێکی دیکەیان بۆ نەدەهات. یەکێك لە چەقەڵەکان خۆی گەیاندە ملی کەلاکەکەو بە قەمپاڵی شارەگی دۆزیبۆوە، وەك ئەوە وابوو ترۆمپایەکی بچووك بە هەولێکی ناکام بیهەوێ ئاگرێکی گەورە دابمرکێنێتەوە. لە ماوەیەکی کورتدا هەموو چەقەڵەکان بەم مەبەستە دابارینە سەر کەلاکە وشترەکە؛ سەرقافلی عەرەبان قامچی سەرکەوتنی بە هەموو هێزییەوە راستو چەپ بەسەر پشتی چەقەڵەکاندا تێدەپەڕاند.سەریان هەڵێنا خۆشیو لاوازی سەرتاپای لەشی داگرتبوون، عەرەبەکانیان دەدی، قامچی بەر لمبۆزیان دەکەوت بە پرتاو هێندێك کشانەوە، بەڵام خوێنی وشترەکە فیچقەی کردو چاڵوچووڵەکانی سەر عەردی پڕ کردبوو و، هەڵمی لێهەڵدەستا؛ چەند شوێنی کەلاکەکە دڕبەدڕ کرابوو؛ چەقەڵەکان نەیان توانی خۆ راگرن؛ دووبارە چوونەوە سەر کەلاکەکە. عەرەبەکە قامچییەکەی هەڵێنایەوە، پیلم گرت، گوتی:"هەق بە تۆیە، گەورەی من، با لێیان گەڕێین کاری خۆیان بکەن. ئێستاکە ئیدی کاتی رۆیشتنە. ئەو دیمەنە ئەوەندەی دێنا سەیری بکەین. حەیوانێکی سەرنج راکێشن، وانیە؟ چەندەش لە ئێمە بێزارن!"

# سەردانی کانگە

ئەمڕۆ ئەندازیاری بڵندپایەی کانگە لەلامان بوو و، پێی‌ڕاگەیاندین ئەندازیارانی کانگە بڕیاریان داوە چەند دالآنی نوێ هەڵکەنین. ڕۆژی سەردان ئەندازیارە لێهاتوو و بڵندپایەکان ئامادە بوون بۆ ئەوەی هەموو کارەکانی پێش دەست بەکار کردن جێبەجێ بکەن. ئەندازیارەکان سەرەڕای ئەوەی زۆر لاون بەلاّم توانیویانە پلەی باش لەبوارەکانی خۆیان دا بەدەست بێنن. ئەو ئەندازیارانە وێك ناچن‌و لە ڕووخساریاندا جیاوازیان هەیە، سەرەڕای ئەوەش ئاڵوگۆڕیان تێدا پێك هاتوە.

لەنێو ئەندازیارەکان دا یەکێکیان جم و جۆڵی زۆرە، قژی خورمایی‌یەو چاوی بە هەموو لایەکدا دەگێڕێ.

یەکی‌تر، دەفتەرێکی چکۆڵەی بە دەستیەوە، بە ڕێ ڕۆیشتنەوە یادداشت هەڵدەگرێتەوە، سەیری دەوروبەری دەکاو، ئەو شتانەی دەیاننووسێ بەراوردیان دەکا.

یەکی دیکەیان، لەکاتێکدا دەستی لە گیرفانی کۆتەکەی دایە دەڵێی جەستەی کێشراوەو بە لەخۆباییبوونەوە بەرێدا دەڕوا. تەنیا هێمای گەنجیی کە تێدا بەدی دەکرێ و نایشارێتەوە دایمە لێوەکانی دەکرۆژێ.

دوای ئەو سێ‌کەسە کەسی چوارەم بە ڕواڵەت هێندێك شت بۆ کەسی سێهەم شی دەکاتەوە ئەویش زۆر حەزی لەو ڕوونکردنەوانە نیە، ئەو کابرایە لەوەی دیکەیان بە بالاّ کورتترەو بەپەلەو ڕاکەراکە دەستی هەڵدەسووڕێنێ، وا پێ‌دەچێ دەیهەوێ هەموو شتەکانی بێ پشوو یەك بین بۆ باس بکا.

کەسی پێنجەم لەوانەیە بڵندپایەترینیان بێ، حەز ناکا کەسی لەگەڵ بێ. جارجار پێش ئەوانی دیکە دەکەوێ جارجاریش وەدوایان دەکەوێ. ئەندازیارەکانی‌تر هەنگاوەکانیانی دەگەڵ ڕێك دەکەن. کزو ڕەنگ زەردەی پێوە دیارەو چاوەکانی لەبەر ئەوەی دەڵێی زۆر هەست بەبەرپرسایەتی دەکا بە قووڵدا چوونو، زۆربەی کات دەستی بە ناوچەوانیەوە دەنێ‌و داڵغە دەیباتەوە.

کەسانی شەشەم و حەوتەم خۆیان کووڕ کردوەو بە ڕێگەدا دەڕۆن سەریان بەسەری یەکدی‌یەوە ناوەو گەرمی قسانن. ئەگەر چکۆلەترین دڕدۆنگی لەوە کەئێرە کانگەی ڕەژوو، ئەو شوێنەی ئێمە کاری لێ‌دەکەین هەبایە. ئەوکات پێت وادەبوو ئەو بەڕێزانە بەو دەموچاوی ئێسقانی، ردێنە تاشراوو لووتی درێژیانەوە دوو قەشەی لاون نەك دوو ئەندازیار. یەکیان لەبەر خۆیەوە پێ‌دەکەنی‌و دەنگی زۆرتر وە مرخەمرخی پشیلە دەچوو، ئەوەی دیکەشیان پێ‌دەکەنی‌و دەستەکانی دەجووڵاندنو، بەم جۆرە هەودای قسەکانی بەدەستەوە گرتبوو. دەبێ ئەو دوو برادەرە چەندە لە پلەو مەقامی خۆیان دڵنیابن لە بەڕێوەبردنی بەرنامەیەکی ئاوا گرنگدا بەبەرچاوی بەڕێوەبەرەکەیانەوە ئاوا بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە خەریکی کاری خۆیان بن، یان هەر نەبێ خەریکی کارێك بن کە پێوەندی بەم کارەی ئێستایانەوە نەبێ. تۆ بڵێی ئەوانە دەگەڵ ئەو هەموو پێکەنینو بایەخ دانەنان بۆ کارەکەی خۆیان هەست بەگرنگی ئەو پڕۆژەیەی ئێستایان بکەن؟ قسەکردن لەسەر ئەو دوو بەڕێزە زۆر ئاسان نیە.

لەلایەکی دیکەشەوە، شك لەوەدا نیە، بۆ وێنە کەسی هەشتەم لەو دوو برادەرەی باسمان کردنو تەنانەت لەهەمووی ئەوانی دیکە زۆرتر خەریکی کارە، کە بۆ بەراورد کردن نابێ. ئەو کابرایە چەکوچێکی چکۆلەی بەدەستیەوە دادەنیشێ‌و لەعەردی دەداو پاشان لەدیوارەکانی تەنیشتی‌و لەکۆتایی‌دا لە بن‌میچی دالآنەکە دەدا. ئەو کابرایە بێ‌ئەوەی گوێ بداتە گڵ‌و خۆڵ لەسەر عەردی دادەنیشێ‌و جل‌وبەرگە خاوێنەکەی پیس دەکاو پاشان ئەو

چەکوچەی لە گیرفانی دەرهێنابوو لەگیرفانی دەخاتەوەو ئەوکارەیکە دەیکا بەئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ. جارێك لەسەر عەردەکە درێژ بووو، بێهەستو خوست بوو. پێمان وابوو شتێك روویداوە، بەڵام پاشان جەستەلاواز باریکەکەی بەجوڵانێکی کورتو خێرا راست کردەوەو هیچیش رووینەدا. ئێمە پێمان وایە هەر هیچ نەزانین برێك سەرمان لەو کانگەو بەردانە دەردەچێ کە بۆ ماوەیەکی زۆرە کاری لێدەکەین، بەڵام ئەوەی ئەو موهەندیسە دەیکا سەرمان لێدەرناچێ.

کەسی نۆیەم شتێکی وەك کالیسکەی مندالآنی وەپێش خۆی داوە، کە پڕە لە شتو ئامێری ئەندازیاری کەلەنێو لۆکە گیراون. ئەگەر راستت دەوێ دەبێ کارەکەرێك ئەو کالیسکەیە لێخوڕێ، کەچی لێرە کاری ئەندازیارێکەو چاومان لێیە ئەم کارە بەوپەڕی رەزامەندیەوە دەکا، بە رواڵەت لە هەموویان گەنجترە، لەوانەیە بەتەواوی نەتوانێ ئەو ئامێرانە بەکار بێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا نیگایان لێناگوێزێتەوەو جاری وایە خەریکە بە کالیسکەکەوە خۆ بە دیوار دا بکێشێ.

لەم مابەینەدا ئەندازیارێکی دیکەش هەیە کە لەپەنا کالیسکەکە بە رێ دا دەڕوا پێش بە رووداوی وا دەگرێ. وا پێدەچێ ئەم ئەندازیارە ئەو شارەزاییەی بەسەر ئەو ئامێرانەدا هەبێ، کە بەرپرسی راستەڤینەی ئەم ئامێرانەیە. جارجار هەر کەوازی لێبوو بێئەوەی کالیسکەکە رابگرێ پارچەیەك لە ئامێرەکان هەڵدەگرێو سەیری دەکاو پێچەکانی شلو توند دەکاتەوە، بە سووکی رایدەوەشێنێو بە گوێیەوە دەنێ، پاشان کاتێ کالیسکەکە وەستاوە ئەو شتەچکۆلەیە کەلەدوورەوە ئالۆز دێتە بەرچاو بە لەسەرەخۆیی لەشوێنی خۆی دادەنێتەوە.

کاروکردەوەی ئەو ئەندازیارە برێك متمانە بەخۆبوونی تێدایە. دیارە تەنیا بە پاڵپشتی ئەو ئامێرانەوەیە وا لە خۆی دڵنیایە. دە هەنگاوی ماوە دەبێ بە ئیشارەی پەنجەی خۆ لەسەر رێگای لادەین، تەنانەت ئەگەر مەودای کشانەوەش نەبێ.

لە پشتی ئەودوو بەرێزەوە کارەکەرێك دەبینرێ، بێئەوەی هیچ کارێکی پێسپێردرابێ دێتەخوار. ئەندازیارەکان هەروەك چۆن زانیارییەکانیان لەسەریەوە دەرژێ، دەمێکە هەموو خۆبەزل زانیەکیان وەلا ناوە؛ بەپێچەوانەوە وا پێدەچێ ئەو کارەکەرە هەموو خۆبەزلزانیو لووت بەرزی ئەوانیشی بۆخۆی بردبێ. ئەو کابرایە دەستی لە لاکەلەکەی ناوەو، جارجار دەست بەدوگمە زەردەکانی کۆتەکەیو جارجاریش بە پارچە سپیە ناسکەکەی کۆتەکەی دادێنێ. سەیری چواردەوری خۆی دەکاو بە هێمای رەزامەندی سەری دەلەقێنێ دەڵێی ئێمە سڵاومان لێکردووەو ئەویش لەبەر گرینگی پلەو پایەی کارەکەی بە لەقاندنی سەر وەڵامی دابینەوە؛ شتێکی زۆر سروشتیيە ئێمەش لە بارودۆخێکی ئاوادا سڵاوی لێناکەین، لەوانەیە ئەو کابرایە پێی وابێ کارەکەری ئیدارەی کانگا دەبێ شوێنێکی گەلێ گرینگ بێ. کاتێ بە لاماندا تێدەپەڕێ پێی پێدەکەنین، بەڵام چونکە ئەگەر لەو کاتەدا هەورەتریشقەش بگرمێنێ لاناکاتەوە، هەبوونی وەك پرسیارێکی بێوەڵام جێگای رێزلێنانە.

ئەمڕۆکە کارو ئیشمان کەم بوو، ئەو وەستانو دەست لەکارهەڵگرتنەی ئەمڕۆ زۆر خۆش بوو دیمەنی سەیرمان دی. سەردانێکی لەو بابەتە بە تەواوی بیری کارکردن لە ئینسان دەستێنێ. ئەگەر دڵەخورپەی ئەو تێڕامانەت بە دوای ئەو بەرێزانەدا کەبەتاریکایی دالآنە تایبەتییەکەی کانگەدا چوونە خوار شۆڕ بکەیەوە لە رادەبەدەر بەهێزە، سەرەڕای ئەوەش ئەوەندەی نەماوە کاتی دەست لەکار هەڵگرتن تەواو بێ؛ ئیدی شاهیدی گەڕانەوەی ئەو بەرێزانە نابینەوە.

# لادێکەی دیکە

باپیرەم دەیگوت:"ژیان چەندە کورتە هەروا دەکەی تێپەڕ دەبێ. ئێستا کە بیر لە رابردوو دەکەمەوە، ژیانم ئەوەندە ئالۆز دێتە بەرچاو، بۆ وێنە تێناگەم چۆن دەکرێ لاوێك بڕیار بدا بچێتە دێهاتەکەی دیکە - بێ گوێدان بە هەر رووداوێك کە لەوانەیە بۆی بێتەپێش - و لەوە نەترسێ ماوەی ئەو ژیانە ئاساییو خۆشە، سەفەرێکی وا نەهێنێ."

# پەیامی ئیمپراتۆری

وەك دەگێڕنەوە ئیمپراتۆر لە گیانەلآدا پەیامی بۆتۆ، تەنیا بۆ تۆ رەعیەتی ماڵوێران بۆتۆ سێبەرێکی کەم و هیچ کە لە بەرامبەر هەتاوی ئیمپراتۆری دا بە دوورترین شوێنەکان هەلاتوی ناردووە.
بە فەرمانی ئیمپراتۆر تەتەر لە پەنا ئەو تەختەی ئیمپراتۆر لەسەری کەوتووە، چۆك دادەداو ئیمپراتۆر پەیامەکەی بە گوێدا دەچرپێنێ. ئیمپراتۆر ئەو پەیامەی ئەوەندە پێ گرنگ بووە، دووبارە پەیامەکە بە گوێی تەتەردا دەچرپێنێتەوە؛ کابرای تەتەر بە لەقاندنی سەری وای پێشان داوە لە پەیامەکە گەیشتووە. ئیمپراتۆریش بە ئامادەبوونی هەموو شاهیدە بێئەژمارەکانی کە هاتوونە سەرە مەرگی فەرمانی داوەو، - هەموو ئەو رێگرو لەمپەرانەی لەسەر رێگای تەتەرن لاچن و، فەرمانڕەوایانی کۆشکی ئیمپراتۆریش کە لەسەر پلیکانە پان و بڵندەکان کە سەریان گەیاندۆتە ترۆپکی ئاسمان لە دەوری یەکتر وەستابوون، شاهیدی ئەو فەرمانە بوون - تەتەری ناردوە پەیامەکەی بگەیەنێ. تەتەر بێ دواکەوتن وەڕێکەوتوە. کابرا بە قەلافەتو بەهێزەو لە رێگە رۆیشتن دا ماندوویی ناناسێ و بە دەستە بەهێزەکانی ئاپۆرای خەلك دڕ پێدەدا. هەرکاتێ بەربەرەکانی و رێگری دەدی ئاماژەی بۆ رۆژی سەر سینگی دەکرد، شکی تێدا نەبوو رێگەیان بۆ دەکردەوە. بەلآم رێگەکان پڕن لە خەڵك و رێگە رۆیشتن نەدەکرا، هەرکاتێك رێگە چۆڵ دەبوو دەتگوت هەواڵنێرەکە خەریکە باڵ دەگرێ وا بە خێرایی دەڕۆیشت و ئەگەر هەروا چۆڵ با لەوانەبو ئەوەندەی پێنەچێ گوێت لە مستە بەهێزەکانی دەبوو کە لە دەرگەی ماڵەکەتی دەدا.
لە کاتێکی وادا هەوڵەکانی تەتەر بە خۆڕاییە، ئەو کابرایە هێشتا لە نێوەندی تالارەکانی نێو کۆشکەکەدا خەریکە رێگای خۆی دەکاتەوەو، سەرکەوتووش نەبووە، ئەگەریش ئەو رێگانە ببڕێ و سەرکەوێ ئەوە دووبارە سەرکەوتنێکی وەدەست نەهێناوەو دەبێ هەتا دوا پلیکانەکان لە هەوڵدان دابێ. ئەگەر ئەو رێگەیەش ببڕێ دەبێ بە حەوشەکاندا تێپەڕێ پاش حەوشەکان کۆشکی دووهەم کە بە کۆشکی یەکەمدا تێپەڕ دەبێ تێپەڕ بکاو بەرێوە بێ. دووبارە حەوش و پلیکان و کۆشکی ترو هەر بەم رواڵەتە هەزاران ساڵی دیکە. ئەوە گوتمان بە ئاخرین دەروازەشدا دەڕوا - بەلآم ئەوە قەت روو نادا، قەت. ئێستە پایتەختیشی لەبەر دەمە. هەروەها ناوەندی جیهانیش کە لێوالێوی گێرەوکێشەو دەردو ئازارە. بێرەدا ئیتر کەس تێناپەڕێ. هەلگری پەیامی مردوویەك ئەوە هەر ناتوانێ.
بەلآم تۆ لە پشت پەنجەرەی ماڵەکەتەوە دانیشتووی و، ئێوارە کە دادێ خەوی پەیام دەبینی.

# نیگەرانی باوك

هێنـدێك كـەس دەڵـێن وشـەی "ئودرادیـك" Odradek لـە بنەڕەتـدا لـە زمـانی ئۆسـلاویەوە هـاتوەو، بـە پێـی ئـەم بۆچـوونەیان هـەوڵ دەدەن پێكهـاتنی ئـەم وشـەیە لێـك بدەنـەوەو بیسـەلمێنن. هێنـدێك كەسـی دیكـەش لەسـەر ئـەم بڕوایەن ئەو وشەیە لە زمانی ئەڵمانیەوە هاتوەو تەنیا لە زمانی ئوسلاوی كاریگـەری وەرگرتـووە. ئـەوەی راسـت بـێ هەردووك تاقم لە بیروبۆچوونەكانیاندا لە هەڵەدان. چونكە هیچ كام لەو دوو تاقمە مانای وشەكە نازانن.

شـتێكی سروشـتیە ئەگـەر بەڕاسـتی گیانلەبـەرێك بـە نـاوی "ئودرادیـك" نەبایـە كـەس وەدوای ئـەو لێكۆڵینەوانـە نەدەكـەوت. ئـەو گیانلەبـەرە وەك غەرغەڕەیـەكی تـەختو ئەسـتێرەیی دەچـێ كـە كوتـە بـەنی كـۆنی جۆراوجـۆری رەنگاوڕەنگ كە لێـك گرێـدراون بـە ئـاڵۆزی لەسـەری هـەڵكرابێ. دیـارە هـەر بـە تـەنیا غەرغـەرەش نیـە، چونكە لـە نێوەڕاستی ئەو ئەستێرەیە دارێك هاتۆتەدەر و دارێكی دیكە لەسەری ئەستوونە. بە یارمەتی داری دووهەم لە لایەكو لە لایەكی دیكەشەوە بە یارمـەتی یـەكێك لـە پـەرەكانی ئەسـتێرەكە ئـەو شـتە وەك ئـەوەی دوولاقـی هـەبێ دەتوانـێ راوەستێ. كاتێ "ئودرادیك" دەبینی دوودڵ دەبیو پێت وایە ئەو گیانلەبەرە لەوەپێش بە كاری شـتێك هـاتووە بـەڵام ئێستا شكاوەو بەكار نایەت. بە پێچەوانەوە بیروبۆچوونێكی وا بەئاسانی بەرپەرچ دەدرێتەوە چونكە نیشانەی شكاوی لەو گیانلەبەرەدا نابینی، ئەگەرچی لەسـەر یـەك درووسـت بـوونو پێكهـاتنی بێمانـا دێتـە بەرچـاو بـەڵام لـە وێنـەی خۆیدا بێ كەمو كوڕیـەو تـەواوە. جیـا لـەو شـتانەش جێگـای قسـەو رەخنـە لـێگرتن نیـە، چـونكە "ئودرادیـك" زۆر چوستو چالاكو خێرایەو ناگیرێ.

جارجار لە ژێر شیروانیو، جارجارەش لەسـەر پلیكـانو دالانو سـالۆنەكان دەبـێ. هێنـدێك جـار بـۆ مـاوەی چـەند مانگێك ون دەبێ دیارە ئەو كاتانە لەوانەیە گواستبێتیەوە بۆ ماڵێكی دیكە بەڵام پاشان لەسەداسەد دەگەڕێتەوە.

جاری وا هەیە كە دەتهەوێ لە ماڵ وەدەر كەوی، لە خوار پلیكانەكان پاڵی وە نەردەكەوە داوەو تـۆش حـەز دەكـەی بیدوێنیو پرسیاری لـێبكەی. دیارە پرسیاری قورسی لـێناكەی بەڵكوو وەك چۆن پرسیار لە منـداڵ دەكـەی ـ چونكە زۆر چكۆلەیە ـ ئاواش پرسیار لەو دەكەی:"ناوت چیە؟" دەڵێ:"ئودرادیك". "ماڵت لە كوێیە؟"، "شوێنی دیاریكراوم نیـە."و پێدەكـەنێ. ئـەو پێكەنینـە بـێ هەناسـەدانیش دەكـرێ ببـێو، كـەمو زۆر وەك خشەخشـی گـەڵای وشـك بـوو دەچێو، زۆربەی كات قسەكانمان لێرە كۆتایی دێ. دیارە دەبـێ ئامـاژە بـەوەش بكـەم ئـەو هـەموو جـارێ وەڵامـی ئـەم پرسیارانە ناداتەوە وەك چڵەدارێك رەق رادەوەستێو هیچی لـێنابیستی.

زۆر جار بە بێهوودەییەوە لەخۆم دەپرسم چی بەسەردێ دەبێ بمرێ؟ هەر شتێكی دەمرێ پێشتر ئامانجو چالاكی هەبووە، هەر بۆیە تاشراوەو مردووە. ئەو شتە سەبارەت بە "ئودرادیك" راست نیە. كەواتە تۆ بڵێی رۆژێـك بـێ بـەو پەتانەوە كە بەدوای دا دەخشێن بە قاچی كوڕو نەوەكانم لەسەر قادرمەكانەوە خل ببێتەوە؟

بە رواڵەت "ئودرادیك" زیانو ئازار بە كەس ناگەیەنێ؛ بەڵام ئەو خەیاڵەی كە لەوانەیە تەمەنی لە من زیاتر بێ، خەیاڵێكی كەمو زۆر بە ژانە.

# یازده کوڕ

یازده کوڕم هەیە.

یەکەمیان هەتا بڵێی ناشیرنە بەلام جیددیو بەهۆشە. ئەگەرچی واپێدەچێ وەك کوڕەکانی دیکەم خۆشم دەوێ، بەڵام نرخێکی وای بۆ دانانێم. زۆر ساویلکانە بیر دەکاتەوە. نە راستی خۆی دەبینێ، نە چەپی نە دووری. بە بەردەوامی لەنێو بازنەی تەنگی بیرەکانی دا دەسووڕێتەوە.

کوڕی دووهەمم لەش و لارێکی جوان و رێك و پێکی هەیە. حەز دەکەی کاتێ وەك شمشێر بازەکان دەکا سەیری بکەی. ئەویش وەك کوڕی یەکەمم بەهۆشە، جیا لەوە دنیادیتووشە، سەفەری زۆری کردوون. گەلێ شتی بینیون. هەر ئەوەیە پێدەچێ وەتەنەکەی زۆرتر رازو نیازی لەگەڵدا بکا هەتا خانەنشینەکان. دەگەڵ ئەوەشدا دڵنیام نابێ ئەم تایبەتمەندییەی تەنیا لە سەفەرەکانی بزانین. بەڵکوو ئەوە لە سیفەتی رووحیەی لاسا نەکراوی دایە، کە بێئەولا ئەولا جێگەی پەسندی هێندێکانە. بۆ وێنە هەرکەس بیهەوێ لاسای خۆ هەڵدانی بۆنێو ئاو بکاتەوە کە زۆر هونەرمەندانەیەو بەسەر خۆیدا زاڵە، ئەو رەقیبەی کاتێ دەچێتە سەر تەختەی باز بردن بە هێمای نەوێران دەستی بەرز دەکاتەوەو داوای لێبووردن دەکا. سەرەڕای ئەوانەش دەبوو پێوەندیم لەگەڵ ئەو کوڕەم باش بایەو شانازیم پێوە کردبایە، کەچی وا نیە. چاوی چەپی برێك لە چاوی راستی چکۆلەترەو زووزوو دەترووکێ.

دیارە ئەم عەیبە چکۆلەیە رووخساری تێکداوە بەڵام لەبەر ئەوەی قەڵافەتی جوانە کەس بیر لەوەناکاتەوە رەخنەی لێبگرێ. من باوکی ئەوەو ئیرادی لێدەگرم ئەویش لەبەر ئەو عەیبە نیە کە هەیەتی؛ بەڵکوو بۆیە ناڕەحەت دەبم ئەم عەیبە چکۆلەیە لەروخساری کوڕەکەمدا جارجار دەبێتە هۆی ئەوە ئالۆزی تێدا بەدیار بکەوێو هەڵسوکەوتی بگۆڕێ. ئێوە نازانن چ ژارێك لەنێو خوێنی دا دەگەڕێ کە بەرگری دەکا لەوەی توانا نێوخۆیەکانی یەك بگرنەوە، تەنیا منیش هەست بەمە دەکەم، لە لایەکی دیکەشەوە هەر ئەو عەیبەیە دەیکاتە کوڕی بە هەقی من، چونکە ئەو نوقووستانیەی لە هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەی من دا دەبینرێ، بەلام لەمەیاندا زۆرتر ئاشکراو بەرچاوە.

کوڕی سێهەمیشم رێك و پێك و جوانە، بەڵام بەم جۆرە نیەجێگای رەزامەندی من بێ. چونکە جوانیەکەی وەك جوانی گۆرانیبێژانە: دەمی جوان، چاوی خومارو خەیاڵاوی، قژی بەستنو جوانکردنی گەرەکە. سینگی زەق و لەپێشە، دەستی بە خێرایی دێن و دەچن لاقی گەلێ باریکنو توانای هەڵگرتنی ئەو لەشە قورسەی نیە. دەنگی کزو ناسکەو جاری وایە بە هەڵەت دەباو پێت وایە قسەت بۆ دەکا بەڵام لە ناکاو دەنگی تەواودەبێ وەهەناسەبڕکێ دەکەوێ. لەگەڵ ئەوەدا جاری وایە تووشی دڵەخورپە دەبم و، پێم خۆشە ئەو کوڕەم بەخەڵك بناسێنم کەچی ئەو کارە ناکەم و دەیشارمەوە. لە لایەکیشەوە ئەویش هیچ ناڵێ کە نایبەمە نێو خەڵك چونکە زۆر حەزی لە خۆنیشاندان نیە. دیارە وەنەبێ هەستی بە کەموکوڕیەکانی خۆی کردبێ بەڵکوو هەروا فەقیروساکارە. ئەو هەست بە نامۆیی دەکا وا دەزانێ هی ئەم سەردەمەی ئێمە نیە. لەنێو بنەماڵەکەمدا هەست دەکا لە ئێمە نیەو، کەسوکاری خۆی نەماون، زۆربەی کات بێتاقەتەو هیچ شتێك شادی ناکا.

لەوانەیە بکرێ بڵێم کوڕی چوارەمم لەوانی کەم خەڵکی ترەو، کوڕی سەردەمی خۆیەتی. خەڵك لێی تێدەگەن. لەسەر عەرزێك وەستاوە هی هەمووانە. ئەگەر قسەت لەگەڵ بکا دەبێ بە لەقاندنی سەر پەسندی قسەکانی بکەی. لەوانەیە بۆیە ئاوا جێگەی پەسندە چونکە بەگشتی قالب سووکە، بێئیدیعایەو، لە قەزاوەتەکانیدا بێخەیاڵیەکی پێوە دیارە. حەز دەکەی بەشێك لە قسەکانی گەلێ جار دووبارە بکەیەوە، دیارە بەشێکیان. بەگشتی تایبەت مەندییەکی هەیە حەزی لە پێداهەڵگووتنە. وەك پەرەسێلکەیەك دەچێ دەفڕێ دەفڕێ، بەڵام ئاخرەکەی بێهیوا لە سارایەکی دوورەدەست دا دەکەوێتە سەر عەرز. ئەم شتانە بینینی ئەم کوڕەم لێحەرام دەکا.

کوڕی پێنجەمم باش و دڵسۆزە. زۆر کەمتر لەوەی بەڕێیەوە دەبرد، بەڵێنی دەدا. ئەوەندە کەم و هیچە کاتێ لەگەڵتدایە هەستی پێناکەی و وادەزانی بە تەنیای. لەگەڵ ئەوەشدا وردە وردە حورمەت و ڕێزی بۆخۆی کۆکردۆتەوە. ئەگەر لێم دەپرسن چۆن وڵامێکم پێنیە. لەوانەیە فەقیری و بێدەنگیەکەی پتر لە هەر شتێکی تر جێگەی لەو بازاڕە شپرێوەی دنیادا بۆ کردبێتەوە. بەڕاسنیش فەقیرو مەعسوومە. دڵسۆزە بۆ هەموو خەڵك؛ لە ڕادەبەدەر دڵسۆز. ئەگەر لای من باسی دەکەن زۆرم پێناخۆشە. چونکە بەڕاستی پێداهەڵگوتن کاری تێدەکا. ئەو کوڕەی من مردووی پێداهەڵگووتنە.

کوڕی شەشەمم پێدەچێ لە یەکەمین نیگادا زیرەکی خۆی دەرخا. دڵسۆزو، زۆربڵەیە. هەر بۆیە بە ئاسانی پێی ناوێری. کاتێ وەدوا دکەوێ، غەمێکی گران دایدەگرێ؛ کاتێ پێش دەکەوێ پێشکەوتنەکەی بە زۆربڵەیی دەپارێزێ. سەرەڕای ئەوانەش دان بەوە دادەنێم زەوقێکی بەجێی هەیە. لە ڕۆژی ڕووناك دا دایمە لە هەوڵ دایە، دەڵێی لە خەو دایە هەتا ڕێگەی بەنێو بیرەکانی دا بدۆزێتەوە. جاری وایە ـ بێ ئەوەی چکۆلەترین ناساخی هەبێ ـ گێژ وحۆل دەبێ بە تایبەت لە کەش و هەوایەکی تەم ومژاویدا. سەرەڕای ئەوەش پێویستی بە یارمەتی نیە. ناکەوێ. هۆی ئەم حاڵەتە لەوانەیە هەڵدانی لەشی بێ. درێژی لە چاو تەمەنی نیە. ئەوە بە گشتی ئەگەر سەیری بکەین ناشیرنی دەکا. سەرەڕای جوانی هێندێك لە ئەندامانی لەشی، بۆ وێنە دەست ولاقەکانی. نێوچاوانیشی ناشیرنە؛ پێستی چرچەو، ئێسقانی دەڵێی دەرچوون.

کوڕی حەوتەمم زۆرتر لە کوڕەکانی دیکەم بەمن دەچێ. خەڵکی قەدرو قیمەتی نازانن. بەتایبەتی زۆر دڵفراوانەو شت بە دڵ ناگرێ. لەخۆوە نیە بایەخی پێی نادەم. دەزانم بایی چەندە. ئەگەر عەیبەی هەموو خەڵکی دنیا ئەوە دەبوو نەزانن چۆن قەدری بزانن، دوبارە جێگەی ئەوە نەبوو ئیرادیان لێبگرین. بەڵام هەرچۆنێکی بێ لەنێو بنەماڵەکەم دا چاوپۆشی لەوە ناکەم. چونکە دەبێتە هۆی ئاڵۆزی و، هەروەها حورمەت بۆ سوونەتەکان. هەردووکیان، بە کەمەوە بە گوومانی من، بە تەواوەتیەکی حاشا هەڵنەگرەوە پێکەوە تێکەڵیان دەکا. دیارە بۆخۆی لەخەڵکی تر کەمتر بەوە دەزانێ بەو تەواوەتیەوە دەتوانێ چ بکا. گەڕاندنی چەرخی دواڕۆژبە دەستی ئەوەوە نیە. بەڵام ئەم لایەنە لە رووحیەی دا زۆر سەیر هیوادەرە. زۆرم پێخۆش بوو منداڵی ببان و منداڵەکانیشی، منداڵی دیکەیان ببان. ئەگەرچی زۆر خۆبەزل زانە، من چاك لێی تێگەیشتووم، زۆریشم پێناخۆشە. دیارە ئەم بۆچوونەم دژی بیروبۆچوونەکانی خەڵکە. ئەو کوڕە بە تەنیایەو نزیکایەتی کچان ناکا، سەرەڕای ئەوەش سەروورووخۆشە.

کوڕی هەشتەمم کوڕی خەمەکانمە، لەراستیشدا نازانم بۆچی.کە سەیرم دەکا وەك بێگانە دێتە پێش چاوم سەرەڕوای ئەوەش هەستێکی باوکانەم بەرامبەری هەیە. تێپەڕینی کات زۆر شتی سەلماندوەو قەرەبوو کردۆتەوە، بەڵام هەر ئەوەندە بەسە بیری لێبکەمەوە هەموو گیانم دەلەرزێ. ئەو کاری بەکاری من نەداوەو، هەموو پێوەندیەکانی دەگەڵ من بڕیون. بێشك بەوکەللەرەقیەو قەلافەتە بەهێزو وەرزشوانانەی هەیەتی ـ تەنیا لاقەکانی لەسەردەمی منداڵیدا سست و لاواز بوونو ئێستاکە چاك بۆتەوە. هەر کارێکی حەزی لێبێ دەیکا. زۆرجار دەمویست بەدوایدا بنێرم بێتەوە، پرسیاری لێبکەم حاڵ و گوزەرانی چۆنەو بۆچی جێی هێشتووم. ئامانجی سەرەکی لەژیانیدا چیە؟ بەڵام لەوکاتەوە زۆر بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیوەو شتەکە کۆن بووەو، وا باشترە شتەکان چۆن بوون هەروا بمێننەوە. بۆیان گێڕاومەوە ئەولەنێو کوڕەکانمدا تەنیا کوڕمە ردێنی داناوە. دیارە ردێنیش لە پیاوێکی کورتەباڵای وەك ئەو نایەتەوە.

کوڕی نۆهەمم زۆر کەشخەیە جل وبەرگی جوان دەبەر دەکا، خوێن شیرنەو، جێگای پەسندی ژنانە. ئەوەندە خوێن شیرینو لەسەرەخۆیە جاری وایە دڵی منیش دەفرێنێ. ئەویش من، هەر ئەوەندە بەسە هەوریەکی تەڕی پێدابێنم و هەموو ئەو درەوشاوەییەی دنیای پێ ون بێ. بەڵام تایبەت مەندیەکی سەیری هەیە، ئەویش ئەوەیەکە قەت خولیای فریودان نەبووە. ئەگەر لێی گەڕێی لەسەر تەختی خەوەکەی پاڵ دەکەوێو سەیری بن میچی هۆدەکە دەکاو ئەگەر بۆشی هەڵکەوت بخەوێ. کاتێ دەکەوێتە خۆشیەکی ئاواوە دەست دەکا بە قسەکردنو قسەی خراپیش ناکا، بەڵام قسەکانی چوارچێوەیەکیان هەیە هەمیشە ئەو شتانە دەڵێتەوە کەباسی کردون.

دەیەمین کوڕم، بەوە ناوبانگی دەرکردوە دەغەڵە. من ئەو تایبەتمەندیەی نە بەتەواوی رەد دەکەمەوەو، نەپەسندی دەکەم. چۆن دەکرێ ئەو شکەی لێنەکەن. کاتێك دەبینین وەك پیاوێکی گەورە هەڵسوکەوت دەکا. بەفیزەوە پانتۆڵو چاکەت دەبەر دەکا دوگمەکانی هەتا سەر دادەخاو، کڵاوێکی کۆن کەرەنگی چۆتەوە لەسەر دەنێ. روخساری وەك دارێکی وشك بووە، چانەگەی دەرپەڕیوەو، مژۆڵی لەسەر پێڵوی چاوی قورسایی دەکەن. دوو پەنجەی لەدەمی نزیك دەکاتەوەو، دێتە پێشو چاوت لێدەکا. هەربۆیە هەرکەسی سەیری دەکا لە دڵی خۆیدا دەڵێ:ئای لەو کڵاوچیە!

بەڵام دەبێ گوێت لە قسەکانیشی بێ؛ هەڵسەنگێندراو؛ وورد؛ کورت و بەسوود؛ پرسیاری قورس و بە کینایەنو بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەرن هاوئاهەنگی دەکەن لەگەڵ هەموو جیهان دا. ئەم هاوئاهەنگیە وەك پێداویستی سەربەرزو دیارە. زۆر کەس هەبوون بۆ سەلماندنی شتو باسو موناقەشە خۆیان بە کەس نەدەگۆڕیەوە بەڵام کاتێ دەگەڵ ئەو تووشی موناقشە دەبوون دەچوونە سەر بڕوای ئەو. هێندێك کەسی دیکەش هەبوون زۆر گوێ نادەنە رواڵەتەکەی بەڵام قسەکانیشی بەهێند ناگرن.

من باوکی ئەوم و لایەنگری لە هیچ تاقمێکیان ناکەم بەڵام دان بەوە دادەنێم تاقمی دووهەم هەقیان بەدەستە.

کوڕی یازدەهەمم گۆشەگیرو دڵناسکە زووزوو دەڕەنجێو، زۆر لاوازە؛ لە هەموو کوڕەکانی دیکەم لاوازترە. بەڵام ئەم لاوازیە تووشی گوومانت دەکا؛ هۆیەکەی ئەوەیە ئەو جارجار لەکاروکردەوەکانیدا بەتوانایەو سوورە لەسەریان بەڵام لە بنەڕەتدا ئەو ئیرادەو توانایەی لەسەر بناغەی سستیو لاوازیە. دیارە ئەم لاوازیە جێگای شەرم نیەو هەرکاتێ رەخنەشی لەسەر بێ رەخنەکە لەسەر ئەم دنیایەیە.

ئایا ئەو باڵندەیەی هەموو هێزی کۆدەکاتەوە بفڕێ بەهۆی لاوازیەوە نیە چونکە حووکمی ترسو پەلەقاژەی هەیە؟ کوڕەکەی منیش هەر ئاوایەو، هەر باوکێك لە بڕی من بایە بەم خەمو خەفەتەوە دەمرد. من زۆرتر لە ترسو دڵەخورپەدا دەژیم چونکە ئەو هەڵسوکەوتانە دەبنە هۆی نزمیو رۆژڕەشی بنەماڵەکەم.

جاری وایە کوڕەکەم تێمەوەرادەمێنێو دەڵێی دەیهەوێ بڵێ:"باوکە، ئاخرەکەی لەگەڵ خۆم دەتبەم!" لەبەر خۆمەوە دەڵێم: "تۆ دوایین کەسی لەوانەیە خۆمی پێبسپێرم." لە نیگای دا ئەم وڵامە دەبینم:"هەر باشە دوایین کەسم."

ئەمانە یازدە کوڕی منن.

# كوژرانی برا

سەلمێندرا کەکوشتنەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بووە: شمار (Schmar)، قاتڵ، لە مانگەشەوێکی سارددا، نزیکەی کاتژمێر نۆ، لە چواررێیانێك بۆسەی داناوەتەوە کە وێز (Wese) قوربانیەکە، دەبوو لەو شەقامەوە کە ئیدارەکەی لێبوو، بسوورێتەوە بۆ ئەو شەقامەی کەماڵەکەی لێبوو.

ئەو شەوە سەرما هەتا سەر ئێسقان دەچووە خوارو کەست بە دەرەوە نەدەدی، شمار بە تویێ فانیلەیەکی شینی تەنك، کە دوگمەکانیشی دانەخستبوو لەبەر ئەو سەرمایە وەستابوو چونکە هۆشی لەخۆینەبوو ئەو سەر ئەو سەری دەکردو، هەستی بەوسەرمایە نەدەکرد. قەمەیەکی توند لەدەستیگرتبوو و، داینەپۆشیبوو. لەبەر تریفەی مانگەشەو سەیری قەمەکەی کرد؛ دەبریسکایەوە؛ بە دڵینەبوو، بۆ ئەوەی قەمەکە تیژ بکا لە لێواری شۆستەی خشاند، پریشکە ئاوری لێهەستا؛ کەچو کروچی تێخست پەشیمان بۆوە؛ بۆئەوەی کەچو کروچەکەی راست کاتەوە بە بنی پێڵاوەکەی داهێنا جیرە جیری لێهەستا. کاتێ قەمەکەی لە بنی پێڵاوەکە دەدا خۆی خوار کردبۆوەو، هاوسەنگی خۆی لەسەر لاقێك راگرتبوو، گوێی بۆ دەنگی جیڕەجیڕی قەمەکە راداشتبوو. لەهەمان کاتیشدا چاوەڕێی دەنگێکیشی دەکرد لە کۆڵانە بەدشوومەکەوە بە گوێی بگا.

پالاس (Pallas) هاووڵاتی، لەو نزیکانە، لەپەنجەرەی ماڵەکەیەوە لەقاتی دووهەم هەموو رووداوەکەی سەیر دەکرد.
ـ ئەو کابرایە بۆ هیچ دژکردەوەیەکی نەبوو. بزانە دەتوانی لە نێوەرۆکی مرۆ تێبگەی؟ـ قەڵافەتە گەورەکەی لەنێوبەرگی خەودا شاردبۆوە، ئێخەکەی هەڵدابۆوەو، چاوی لەخوارەوە دەکردو بێهەستو بێدەنگ بوو.

پێنج خانوو لەولاتر لەوبەری شەقامەکە خێزانی وێز پاڵتۆکەی کە لە پێستی رێوی بوو لەسەر بەرگی خەویەوە بەسەر شانی دادابوو و، چاوەڕوانی مێردەکەی دەکرد کە ئەمشۆ زۆر وەدرەنگ کەوتبوو.

سەرەنجام دەنگی زەنگی دەرگەی ئیدارەی وێز بەگوێ دەگا؛ دەنگەکە زۆر گەورە بوو وە دەنگی زەنگی دەرگا نەدەچوو، لەم شارەدا دەنگی دەدایەوە. وێز ئەو مرۆڤە ماندووی نەناسە کە شەوانە کاری دەکرد ئێستا نەهاتبووە سەر شەقام تەنیا دەنگی زەنگەکە هێمای هاتنەدەریەتی؛ لە بیناکە دێتەدەرو بێدواکەوتن. بەدرێژی شۆستەکە هەنگاوە نەرمەکانی دەژمێرێ.

پالاس، بە تەواوی خۆ بەسەر پەنجەرەکەدا بەرەو دەرەوە شۆڕ دەکاتەوە. ئەو نابێ لە رووداوەکە غافڵ بێ. خێزانی وێز کە لە بیستنی دەنگەکە دڵنیا دەبێ، پەنجەرەکە بەتەقەتەق پێوەدەدا. بە پێچەوانەوە شمار دێتە سەر ئەژنۆیان چونکە هیچ جێگایەکی بەدەرەوە نییە دەستو دەمو چاوی بەبەردەکانەوە دەنێ، شمار لەو سارده شەوەدا گەرم گەرم بوو.

راست لەنێوان دووشەقامەکەدا وێز هەڵوێستەیەك دەکا. تەنیا گۆچانەکەی کە بۆتە کۆڵەکەی جەستەی ئەو سنووره تێدەپەڕێنێ، نازانێ بۆچی راوەستا. تریفەی مانگەشەو ئاسمانی خۆڵەمێشیو زەردباو سەرنجی راکێشاوەو، بێئاگا لەهەموو شتێك تێیەوە رادەمێنێ؛ کڵاوەکەی سەری لادەباو دەستێك بە قژی دادێنێ هیچ شتێك لە زەینیدا لە داهاتوویەکی نزیك نادوێ، شتەکان لە شوێنێکی بێواتاو ئەستەم دا ماونەتەوە. ئەمە کە وێز درێژە بە رێگارۆیشتنەکەی دەدا زۆر سروشتیە، بەڵام ئەم رێگەیە بە قەمەی شمار کۆتایی دێ.

شمار بە پشت ئەستووری پەنجەکانی پێیو باسکی بەهێزی قەمەکەی بەدەستەوەیە و دەگوڕێنێ:"وێز، وێز، یولیا (Julia) بێهوودە چاوەڕوانە." قەمەیەکی لە لای راست و یەکدانەی لەلای چەپی ملیداو، سێهەم دانەی بە زگیدا بردەخوار. ئەگەر سکی مشکێك بدڕی دەنگێکی وەك وێزی لێدێ.

شمار دەڵێ:"تەواو" و، قەمە خوێناویەکە کە ئێستاکە شتێکی زیادییەو بێکەڵکە فڕێدەداتە بەردەرگای یەکەم ماڵ. "سەرەنجام بەرهەمی قەتڵ، بەتاڵ بوونەوەو هەناسەی ئاسوودە هەڵکێشان، سەرخۆشی. سووك بوونو فڕین لە خۆشی بینینی خوێنی مرۆڤێکی دیکەش. وێز ئەی شەمشەمەکوێرەی پیر، ئەی دۆست، ئەی هاوپیاڵە وەکو ئاو بەعەردی رەشی ئەو شەقامەدا دەچێتەخوار. چ دەبوو ئەگەر بڵقێکی پڕلەخوێن بایەی هەتا لە سەرت دانیشم بۆئەوەی دوادڵۆپت بڕێژم؟ هەموو هیوایەك وەدی‌نایەت، هەمووخەونێك بەرهەمی نابێ، پاشماوە قورسەکەت لێرە کەوتووەو هەست بە هیچ شەقێك ناکا. ئەو پرسیارە بێدەنگو وڵامەت کەلە پاشماوەکەتی دەکەی بۆچیە؟"

پاڵاس کە خوێناوی جەرگی دەخواردەوە لەنێو دەرگەدا راوەستاوە. "شمار، شمار؛ هەموو شتێکم بەم دووچاوەی خۆم دی."

پاڵاس و شمار سەیری یەکتری دەکەن. پاڵاس دەگاتە مەبەستی خۆی، شمار بە هیچ ئاکامێك ناگا.

خێزانی رێزدار وێز، لەگەڵ کۆمەڵێك کە لەنێوخۆیان گرتووە، بە روخسارێکی بزرکاوەوە بەپەلە دەگاتێ. پاڵتۆ چەرمییەکەی لەسەر شانو ملی بەردەبێتەوەو، جەستەی دەکەوێتە سەر وێز.

جەستەی کە بە بەرگی خەو داپۆشراوە بەشی وێزەو، پاڵتۆ چەرمییەکە کە ئەو جووتەی وەك شینایی چواردەوری قەبر لەنێوخۆ گرتووە بەشی خەڵکە.

شمار دوایین هەستەکانی رشانەوەی بە زەحمەت قوت دەداتەوە، دەمی بەشانی پاسەوانەکەوە نووساندوە کە وردە وردە دووری دەکاتەوە.

# خەو

ژووزف. ك (Joseph.k) خەونی دەدی:

هەتاو دەدرەوشایەوەو، "ك" دەیویست پیاسە بكا. بەڵام هێشتا دوو هەنگاوی نەنابوون كە گەیشتە گۆڕستان. ئەو نزیكانە ڕێگای پێچاوپێچی ئەستەمی هەبوون، كەبەلێزانیەكی تەواوەوە دروست كرابوون. لەیەكێك لەم ڕێگایانەدا وا هەڵخلیسكا بە دەستێكی هاوسەنگی خۆی پاراست وەك ئەوەی بەسەر ئاوێكی بەخوڕ دا بڕوا وابوو. لە مەودایەكی دوورەوە چاوی بە كۆگڵی گۆڕێكەوە كەوت كەهەڵیان دابۆوە، ویستی لە تەنیشتی بوەستێ. "ك" پێیخۆش بوو هەرچی زووتر بگاتە ئەوكۆگڵەو بزانێ چیە. ئەو هەستی دەكرد هەتا پەلە بكا باشترە. بەڵام دەتگوت ناگاتێ، جارجار كۆگڵەكە لەبەر چاوانی دووردەكەوتەوە، ئەو ئاڵایانەی دەشەكانەوەو بەتوندی بەر یەكتری دەكەوتن پێش چاوی دەگرت؛ ئەوانەی ئاڵاكانیان بەدەستەوە بوو نەدەبینران، بەڵام وێدەچوو ئەو نێوە هەراو هوورایەكی سەیری لێبێ.

لە كاتێك دا نیگای لەدوورەوە رامابوو، لەنەكاوهەمان كۆگڵێ لە نزیكی خۆیو لە قەراخو پاشان پشتی سەری خۆی دیو، بە پەلە خۆی فڕیدایە نێو گیاوگۆڵی دەوروبەری گۆڕەكە. چونكە لەكاتی خۆهاویشتنەكەیدا خێراو شێتانە دەڕۆی، هاوسەنگیەكەی بۆ نەپارێزراو ڕاست لەپێش كۆگڵەكە لەسەر ئەژنۆیان وەعەرزی كەوت. دووكەس لەمبەر ئەوبەری گۆڕەكە وەستابوونو پێكەوە بەردی گۆڕەكەیان بەدەستەوە بوو؛ هێشتا"ك" نەگەیشتووە لایان بەردەكەیان چەقاند. یەكدابەدووكەسی سێهەم لەنێو كۆدەوەنێك هاتەدەرو، "ك" بۆی دەركەوت كابرا هونەرمەندە. تەنیا پانتۆڵو كراسێكی كە دوگمەكانی خراپ داخستبوون دەبەردابوو و، كڵاوێكی ئاوریشمی گەورەی لەسەر نابوو. كابرا قەڵەمێكی بەدەستەوە بوو و، بە ڕێگاشەوە كاتێ لێی نزیك دەبۆوە بە ئاسمانەوە شتی دەكێشایەوە.

پاشان بەو قەڵەمەی بەدەستیەوە بوو لەسەر بەردێكەوەدەستی بەكار كرد. بەردەكە زۆر بەرز بوو و، پێویستی بە داهاتنەوە نەبوو. بەڵام چونكە ئەو نەیدەویست لاق لەسەر كۆگڵی گۆڕەكەدانێ گڵەكە مەودای خستبووە نێوان ئەو و بەردەكەوە. بۆیە ناچار بوو بە پێشدا دابێتەوە. كەواتە لەسەر پەنجەی پێی وەستابوو و، بە لاشانی چەپی پاڵی وە بەردەكەوە دابوو. بە لێزانیەكی تەواوەوە كە بەكاری دێنا هەر بەو قەڵەمە توانی وشەیەكی زەردی زیڕن بنووسێ:"ئێرە گڵكۆی..." هەر پیتێكی جوانو ڕێكو پێك كە هەڵكەندرابوو لە ڕەنگی زەردێكی زێڕینی نایاب بوو. كاتێ ئەو دوو وشەیەی نووسی سیلاوسیل سەیری "ك" كرد. بەڵام "ژوزف.ك" بە دڵەوە درێژەی بە كارەكەی دا، هۆشی كابرای نەبوو. تەنیا سەیری بەردەكەی دەكرد. پیاوەكەش رووی وەرسووڕاند بۆئەوەی كارەكەی درێژە پێبدا، نەیدەتوانی، بەرگریەك هەبوو قەڵەمەكەی لابردو، سەرلەنوێ سەیری "ك"ێی كردەوە. لەم كاتەش دا "ك" سەیری هونەرمەندەكەی كرد تێگەیی كابرا دەستی تێكەڵ پێكەڵ كردوە، بەڵام نەیدەزانی بۆ. كابرایهونەرمەند وەك سەرەتا بە زەوقەوە خەریكی نووسین نەبوو. ئەمە بوو بەهۆی ئەوە "ك"یش سەری لێتێك بچێ؛ هەردووكیان وەستابوونو سەیری یەكتریان دەكرد. لێك تێنەگەیشتنێك هاتبووە بەرەوە هەردووكیانی نیگەران كردبوو.

لەو كاتەدا دەنگی زەنگی كلیسا بێئەوەی كاتی بێ هات هونەرمەندەكە دەستی بەرز كردو دەنگەكە بڕایەوە، بەڵام پاش تۆزێك دەنگی زەنگەكە هاتەوە؛ ئەم جارە زۆر لەسەرەخۆتر دەنگی هاتو وردەوردە دەنگەكە نەما، دەتگووت بەم كارەی دەیهەوێ دەنگدانەوەكە تاقی بكاتەوە. "ك" لەو كارەی هونەرمەند بێتاقەت بوو و لە پرمەی گریانیدا، دەستەكانی بەدەمووچاویەوە نابوو و، رقەكەی پێدەشاردەوە. هونەرمەند چاوەڕوان بوو هەتا "ك" ئارام بۆوەو چونكە ڕێگەچارەیەكی نەدۆزیەوە بڕیاریدا هەرچۆنێكی بێ درێژە بە نووسینەكەی بدا. یەكەم شت كەنووسی لەبری

رزگار کردن بوو بۆ "ك". بەڵام هونەرمەند سەرەڕای هەوڵێکی زۆر کە دەیدا نەفرەتێکی لەکارەکەی خۆیدا هەست پێدەکرد.

ئەو وشانەی دەینووسین جوان نەبوون و زەردیە جوانەکەی نەمابوو. بە بێهیوایی‌و بە رەنگێکی بزرکاوەوە قەڵەمەکە دەجولا. تەنیا پیتێك کە نووسرا "ی"یەکی گەورە بوو خەریك بوو نووسینەکەی تەواو بکا هونەرمەندەکە لە خەفەتان ئاگای لەخۆ نەبوو قاچێکی توندی بە کۆگڵی گۆڕەکە دادا بە جۆرێك گڵ لە هەموو لایەکەوە بەچواردەوریدا پرژو بڵاو بۆوە. سەرەنجام "ك" لە مەبەستەکەی تێگەیشت‌و، کاتیش بەدەستەوەنەمابوو داوای لێبووردن بکا: بە هەردو پەنجەی ئەوگڵەی دەکۆڵی، بەڵام کەڵکی نەبوو. وێدەچوو هەموو شتێك پێشتر ئامادە کرابێ، یەکدابەدوو کونێکی گەورە دەمی‌کردەوەو "ك" لەسەرەخۆ خزی‌و بەرەو کونەکە راکێشراو، کەوتە ناو گۆڕەکە. "ك" کە بەرەو خوار دەچوو و، پەلەقاژە ئیدی بێئاکام بوو لەوکاتەدا ناوەکەی بە نەقش‌و نیگارێکی گەورەوە لە چاولێکنانێکدا کەوتە سەر تەختە بەردەکە.

لە ئەفسوونی ئەو دیمەنەدا "ك" لەخەو هەستا.

# راپۆرتێك بۆ ئاكادمییەك

**ئەندامە بەڕێزەکانی ئاكادیمی ئەوكاتەتان باش!**

**ئێوە ئەوهەلەتان بۆ رەخساندوم و لە چكۆلەی خۆتانویستووە لەسەر ژیانی رابردووم کە مەیموونێك بووم راپۆرتێكتان پێشكەش بكەم.**

**دەبێ بڵێم بەداخەوە بەجێهێنانی ئەو داواكاریە کە جێگای پەسندی ئێوە بێ گەلێك دژوارە. نیزیکەی پێنج ساڵێك دەبێ لە ژیانی مەیموونی بە دوورم، ماوەیەك کە لەوانەیە بۆ هەڵدانەوەی پەڕی رۆژژمێر كەم بێ بەلاّم بۆمن ئەم ماوەیە كەلەگەڵ ناودارانی سەردەمەكە بووم. لە كۆڕوكۆبوونەوەكانیان گوێبیستی چەپڵە بەردەوامو دەنگو نەوای ئۆركێسترا بووم. لە هەمان كاتیشدا غەریبو تەنیاو بێكەس بووم ماوەیەكی گەلێ زۆرو درێژ بووە، چونكە هەموو ئەو دانیشتنو هاوڕێیەتیانە ـ بۆ ئەوەی لە مەبەستەكەم دوورنەبووبمەوە ـ لە دوورەوە بوون. هەركاتێ دەمویست ئاوڕ لە رابردوو و سەردەمی لاویم بدەمەوەو، بیسەلمێنم چی بووم كێشەم بۆ دروست دەبوو.**

**هەربۆیە یەكەم بڕیارم ئەوەبوو واز لەسەرەڕۆیی بێنمو مل بدەم، من مەیموونێكی سەربەست بووم زنجیری یەخسیری لە دەستو پێكراو، رابردووشم دەرگای لەسەر داخستم.**

**ئەگەر ئینسانەكان وازیان لێهێنابام لەوانەبوو بتوانم خۆم لەو رۆژرەشیە دەرباز بكەم. لە سەرەتادا رێگای دەرباز بوونم بە قەت نێوانی عەرزو ئاسمان بوو، بەلاّم ئەو رێگای دەرباز بوونەم هەتا هەوڵم دەدا لێبەرتەسكو تەنگتر دەبۆوە. ئاخرەكەی وام لێهات یەخسیر كرامو لە پەنا ئینسانەكان هەستم بەئارامی كرد. ئەو گەردەلوولەی كە سەرچاوەی ژیانی رابردووم بوو تا دەهات هێدی دەبۆوەو، ئەمڕۆ تەنیا هەناسەیەكە لاقەكانم فێنك دەكاتەوە. ئەو زاركە دوورەی ئەو هەناسەیەی پێدادێو منیش رۆژێك بەوێدا هاتووم ئەوەندە تەسك بۆتەوە، ئەگەر تواناو هێزی ئەوەم دەبوو بگەمە ئەوێ، دەبوو توێخێكی پێستم دانێم هەتا بتوانم پێیدا تێپەڕ بم.**

**بێشاردنەوەی هیچ شتێك پێم خۆشە ئەگەر ئیزن بدەن ئەوە بڵێم: بەڕێزان ئەو ژیانە مەیموونیەی ئێوە هەتا ئەمڕۆ تێیدا بوونو ژیاون بە پێچەوانەی ویستی خۆتان قەت بۆ ساتەوەختێكیش لێتان دوور نەكەوتۆتەوە. هەروەك چۆن ئەو حاڵەتە لە منیشدا هەر ماوە. لەو ژیانەدا لە بەری پێی شامپانزەیەكی چكۆلەوە بگرەهەتا "ئاشیل"ێكی گەورە بە یەك رادە لەكاتی سووڕانی زەوی بەری پێیان دەخورێ. بە پێی ئەم روونكردنەوەیەو بوونی خۆشەویستی هاوڕەنگی لە نێوانماندا هەوڵ دەدەم لەم بانگهێشتنەدا وڵامی پرسیارەكەی ئێوە بدەمەوە. دیارە ئەمە جێگای رەزامەندی خۆشمە. یەكەم شت كە فێری بووم دەست لێدانەوەو، تۆقە كردن بوو. دەست لێدانەوە سەداقەتی تێدایە. ئەمڕۆكە گەیشتوومە ئەوپەڕی پێشكەوتن، هیوادارم بتوانم بەو دەست لێدانەوە سادقانەو دڵسۆزانەیە، بە سەداقەتی ئاخاوتنیش زیاد بكەم. دیارە بەم كارەم شتێكی نوێم وەك دیاری بۆ ئەكادیمیەكەی ئێوە بەدیاری نەهێناوەو، ئەوەی ئێوە داواتان لێكردووەو ئەوەی لە دڵی خۆشم دا هەیە ناتوانم دەریبڕم. ـ بەلاّم هەرچۆنێكی بێ مەبەستم ئەوەیە ئاماژەیەیەك بكەم بە رێگەیەك كە مەیموونێكی خاوەن ئەزموون پێیدا هاتە نێو دنیای ئینسانەكانەوە. سەرەڕای ئەوەش، نەمدەتوانی ئەوەندە زانیاریە كەمەش كە من هەمە بتان دەمێ ئەگەر لە پلەو پایەیەی لە هەموو بوارەكانی ژیانی موتەمەدینی دنیادا هەمە دڵنیا نەبام، ئەوەندە زانیاریانەشم لەدڵی خۆم دا زیندانی دەكردنو بۆ هەمیشە دەمهێشتنەوە.**

**من لە بەندەری زێڕ لەدایك بووم، سەبارەت بە چۆنیەتی دیل كرانم بۆخۆم شتێكی ئەوتۆم لەبیر نیەو، هەربۆیە ناچارم پەنا بۆ قسەو گێرانەوەی خەڵكی دیكە بەرم. تاقمێك لە راوچیانی نێردراوی كۆمپانیای هاگنبك (Hagenbeck) ـ دەبێ ئەوەش بڵێم لەو كاتە بەدواوە، واتە لەكاتی بەدیل گیرانمەوە دەگەڵ بەڕێوەبەری ئەو تاقمە**

راوچیه بووم به برادەرو گەلێ شووشه شەرابی دەرەجه یەكەم بەتاڵ كردوون - لەدارستانی نزیك بەندەر له بۆسەدابوون. لەكاتێكدا لەگەڵ تاقمێك له مەیموونەكانی دیكه دەچووینه سەر كانی ئاو بخۆینەوە له ناكاو گوێمان له دەنگی چەند گولله بوو تەقێندران. تەنیا من پێكرام؛ دوو گوللەم بەركەوتبوون. گوللەیەك سەر چیخ لارووهەتی گرتبوومو جێشوێنێكی سووری بەجێ هێشت كەمووی لێنەهاتەوە. دیاری ئەو گوللەیه ناوناوبانگی پیتەرە (Peter) سوور بوو بۆم جێما. ناوێكی گەلێ ناحەزو ناشیرین؛ كه تەنیا له داهێنانی مەیموونێك دەوەشێتەوە. ئیزنم بدەن ئەوەش بلێم، ئەو مەیموونه زانایەی ئەو ناوەی لەمن نا لەم دواییانەدا ناووناوبانگێكی بۆخۆی دەركردبوو لەگەڵ من هەر ئەو لەكه سوورەی سەر كوڵمی جیاوازی هەبوو و، هیچی تر نا. شوكر ئەم دواییانه سەقەت بووەو ناویشی له نێو ناوان نەماوە.

گوللەی دووهەم، بن رانی گرتم برینەكه قورس بوو و ئێستاش هەر دەشەلم. ئەو رۆژانه وتارێكم خوێندەوە یەكێك لەو هەزاران بێعەقڵانەی شتم لەسەر دەنووسنو تیروتوانجم تێدەگرن نووسیبووی ئێستاش تایبەت مەندی مەیموونێك له من دا ماوە. بەڵگەشی بۆ قسەكەی ئەوەیه كاتێ خەڵك دێنه سەردانم پانتۆڵەكەم دادەنێمو جێگەی برینەكەیان پێشان دەدەمو، ئەوكارەش زۆر بەخۆشییەوە دەكەم. دەبێ ئەو پەنجانەی ئەو قەڵەمەیان گرتووە دانەدانه بشكێنی. من سەربەستمو بەكەیفی خۆمه برینەكه پێشانی خەڵك بدەم یان نا. بەوان چی سەرەڕای ئەوەش جیا له جێگەبرینو پێستێكی خاوێن چیتر پێشانی خەڵك دەدەم. هەموو شتێك ئاشكرایەو بۆ شاردنەوە نابێ. هەركاتێ بتهەوێ راستی باس بكەی ئەگەر خانو بەگزادەش بی دابو نەریتو رەسمەكان وەلادەنێی. ئەگەر بێتو خەڵك بۆ وێنه بچنه دیداری نووسەری بەرێزی وتارەكەو ئەویش پانتۆڵەكەیان بۆ دانێ، دیاره شتەكه لایەنێكی دیكه بەخۆوە دەگرێو منیش دووریو نەكردنی ئەو كارەی ئەو به عاقڵەتی دەزانم. باشتره شەری ئەو خۆبەزل زانیەو ئەدەب زانیەی لەسەرم لابا.

لەدوای ئەوەی ئەودوو گوللەیەم بەركەوتن بێهۆش بووم. كاتێ وەهۆش هاتمەوە - لێرەوە بیرەوەریەكانم دەست پێدەكەن - لەنێو كەشتی هەڵمی هاگنبك لەنێو قەفەسێكی حەیوانان دابووم. قەفەسەكه تەنیا قەفەسێكی ئاسن نەبوو، بەڵكوو سێ لاشی هەبوون كەبەسندووقی تەختە قایم كرابوو. واته دیواری چوارەمی سندووقێكی دار بوو. ئەو قەفەسه ئەوەنده نەوی بوو نەمدەتوانی تێدا راستبمەوەو لەبەر تەنگەبەریو تەسكیشی دانیشتن نەدەكرا. هەربۆیه كرۆشكەم كردبوو هەڵدەلەرزیم حەزم بەبینینیكەس نەدەكردو، پێم خۆش بوو لەتاریكیدا بمێنمەوە. ئەوان رەسمیان ئەوەبوو حەیوانه وەحشیەكان لەنێو ئەم قەفەسانەدا هەتا ماوەیەك زیندانی بكەن. ئەمڕۆ دوای ئەوەی ماوەیەكی زۆر بەسەر ئەو رۆژانەدا تێدەپەڕێ ئەو هەڵوێستەی ئینسانەكانم پێ شتێكی راسته؛ بەڵام ئەوكات پێم وانەبوو.

بۆ یەكەم جار بوو له ژیانم دا تووشی كێشەیەكی وا بووبووم، رێگای دەربازبوونم نەبوو. نەك ئازاد نەبووم بەڵكوو جێگای هەڵسووڕانیشم نەبوو؛ رێگەی بەرامبەرم سندووقه تەختەكه بوو. سندووقه تەختەكه كەلێنی ئەوسەر تا ئەوسەری تێدا بوون بۆ یەكەم جار كه كەلێنێكم دیەوە به نووزه نووزو، خۆشیەكی نەفامانەوە به پێشوازیەوە چووم. بەڵام ئەوكەلێنه بۆ هەڵكێشانی هەناسەش نەدەبوو و ئەگەر هەموو هێزی مەیموونێكیشت بەكار هێنابا بۆ فراوان كردنەوەی نەدەتوانی ئەو كاره بكەی.

زۆر بەسەر ئەوەدا رابرد. بۆیان دەگێڕامەوە، زۆر گۆڕابوومو، هاتو هاوارم نەدەكرد، هەربۆیه پێیان وابوو یان لەوانەیه بمرم؛ یان لەو قۆناغه ئاڵۆزەدەروونیه رزگار دەبم و دەستەمۆ كردنم ئاسان دەبێ، ئاڵۆزیه دەروونیەكەم نەما. بینم دەخواردەوەو خنكاندنی گریانه رقاویەكان، هەڵبەز هەڵبەزه بەژانەكانی ئەسپێكان، لێسانەوەی ماندووانەی نارگیل. سەر له دیواره دارەكەی قەفەسەكه دان، زمان دەرهێنان له كەسێك لێم نزیك دەبۆوە - ئەوانه سەرەتای دەست پێكردنی ژیانی نوێم بوون. بەڵام سەرەڕای ئەوانەش هەستم دەكردو دەمزانی رێگای رزگار بوونم نیه. من بەم شێوەیه بەربەرەكانیم لەگەڵ دەكردن.

ئەمڕۆ كه بیر لەو رۆژانه دەكەمەوە ناتوانم وشەیەك هەڵبژێرم دەربڕی هەستو ئازاری ئەوكاتەم بێو ئەوەی ئەمڕۆ دەریدەبڕم تەنیا وشەی مرۆڤەو هەربۆیه ناتوانم هەستی ئەوسەردەمەم بەوشەی مرۆڤ دەرببڕم. دیاره دەبێ ئەوه بلێم ئەگەر نەتوانم پێناسەیەكی بەپێزی ژیانی ئەوكاتەم كه مەیموونێك بووم بكەم؛ بەڵام لەهەمان كاتیشدا شكو گومان لەوەدا نیه به ئاقار راستەقینەی رابردووەدا تێپەڕ بووم.

هـەتاكو ئـەو رۆژەی گـیرام رێگـای دەربـاز بـوونو هـەلاتنم زۆر بـوو، بـەلام ئەگـەر پاشـان دەسـتو لاقیشـیان بەستبامایەوە، هەستم بـەوە نـەدەکرد ئـازاد نـیم. بۆچـی؟ ئەگـەر شـەو رۆژ نێـو پەنجەکانی پێت خوراندبایـە هـەتا خوێنیان لـێدەچۆڕایەوە هەستت پـێنەدەکردو، ئەگەر میلەکانی قەفەسەکەت ئەوەندە پالْ پێوەنابا هەتا بـە پشـتت دا دەچوونە خوار نەت دەتوانی رێگەی دەرباز بوون بکەیەوە. رێگای دەربـاز بـوونم نـەبوو بـەلام بەهـەر شـێوەیەك بـوو دەبـوو رەخسـاندبام مـن بـێ بـیری رزگـار بـوون نـەدەژیام. هـەردەم بەرامبـەر دیـوارە تەختەکـە - بێشـك وەك مەیموونـەکانی دیکـەی شـیرکەتی "هاگنبـك"م بەسـەر دەهـات کەچارەنووسـیان لـەنێو قەفەسـەکاندا دیـاریکراو بووـ دادەنیشتمو بیرم دەکردەوەچۆن خۆ لەم چارەنوسە رزگار بکەم. بڕیارم دا سروشـتی مـەیموونیم وەلا بنـێم ئـەو بـیرە بەزگم دا دەهات. چونکە مەیموونەکان بەزگیان بیر دەکەنەوە.

واتێدەگەم نەزانن مەبەستم لە خۆدەربازکردن چیە. کەواتە روونترو ئاشکراتر بلْێم مەبەسـتم ئـەوە نیـە ئـازادو سەربەست بمو بۆ هەر لایەك پێم خۆش بێ بڕۆم بەڵکو مەبەستم ئەوەیە چوارچێوەیەکی گـەورەترم هـەبێ. کەواتـە مەبەستم لە ئازادی ئەو هەستە گەورەیە نیە کە هەیە. لە شیکردنەوەی ئەو چەمکە خۆ دەپـارێزم چـونکە زۆر شـت هـەن مـن دەسـتم وێـڕا نەگەیشـتوون. بـە پێـی سروشـتی مـەیموونیم هێنـدێك بیروبۆچـوونم سـەبارەت بـە ئـازادی هەبوونو، زۆر مرۆڤیشم دیوون ئارەزوو هیوایان ئازادی بووە، بەلام من ئازادیم نەدەویست نـە ئـەوکات نـە ئێسـتاش. ئاماژە بەوەش بکەم: ئینسانەکان لەزۆر روانگەو بارەوە خۆیان بەو واتایە فریو دەدەن. سەرەڕای ئـەوە کـە ئـازادی لـە پیرۆزترین هەستەکانی تێدایە بەو رادەیەش گەورەترین سەرلێشوانەکانیش هەر لەوەوەیە.

زۆر لەوهونەرمەندانەم دیووە کەلەکاتی یاری سیرك دا لەسەر پەت و بـەو پەتانـەی خۆیـان پێـوە هەلاوەسـیوە زۆر هونەرمەندانە لەو سەرەوەوە خۆیان هەلْداوەو خولیان خواردوەو نەیان هێشتووە بەربنەوەو، دەستی یەکتریان گرتوە. لە یەکێك لەو دیمەنانەدا کچ و کوڕێك پێشـان دانیـان دەکـرد کوڕەکـە بـەددانی پرچـی کچەکەی گرتبـوو. مـن لەبـەر خۆمـەوە گـوتم:"بـەوەش دەلْـێن ئـازادی بەشـەر. ئـەو حەرەکەتانـە دەسـەلاتو زالْ بـوونی رەهایـان دەوێ." هـەتا چ رادەیـەك بـە گالتـەیان گرتـووی ئـەی سرووشـتی پـیرۆز! ئەگـەر مەیموونـەکان ئـەو دیمەنانـەیان دەدی ئەوەنـدە پێدەکەنینو قاقایان لێدەدا هەتا دەپسان.

ئازادیم نەدەویست، تەنیا رێگای دەرباز بوون بەهـەر لایەکـدا بـا، دەنـا هـیچ داواکاریـەکی دیکـەم نـەبوو. تەنانـەت ئەگەر ئەو رێگەی دەربازبوونە فریویشی دابام. داواکاریەکە وانـەبوو، کەواتـە فریوەکەشـی چ نـەدەبوو؛ هـەر ئەوەنـدە رێگەم هەبا بەرەو پێش بچم دەسـتەکانم بـەرز بکەمـەوە خـۆ بـەدیوارە داریەکـەوە هـەلْواسمو، هـەر نـەبێ جموجـۆلْم هەبێ.

ئەمڕۆ کە ئەوکاتانەم بیر دەکەوێتەوە، ئەگەر ئارامی دەرونیم نەبا قەت رزگار نەدەبوومو، هەموو ئەوەی وەدەستم هێنابوو لە ئاکامی ئەو ئارامیە دەروونیەوە بوو یەکەمین رۆژەکان لـە کەشـتیەکەدا پـێم بـڕا؛ ئـەو ئارامیـەش هـەولْی مسافیرەکانی کەشتیەکە بوو.

خـەلْکێکی گەلـێ بـاش بـوون ئێسـتاش دەنگـی هەنگاوەقورسـەکانیان لەخـەو و بەخەبـەریدا دەبیسـتم. ئـەوان لـە جێبەجێ کردنـی کارەکانیـاندا لەسـەرەخۆ بـوونو بـەوە راهـاتبوون. بۆوێنـە کاتـێ یـەکێك لـەوان دەیویسـت چـاوانی هەلْگلۆفێ بەشێوەیەك دەستی بەرەو چاوی دەبـرد دەتگـوت ئاسـنێکی قـورس هەلْـدەگرێ. گالتـەکردنو شـۆخیەکانیان توندوتیژ، بەلام دلْسۆزانە بوو. پێکەنینیان پڕمینو زایلْەیەکی ترسناکی هەبوو بەلام دوور بوو لە رق.

هەمیشە مستێکیان تف لەدەمیان دابوو جێگـای بـا یـان نـا رۆیـان دەکـرد. جارجـار ئەسـپێی لەشـم دەپەڕیـە سـەر لەشیان زۆر تووڕە دەبوون، بەلام قەت لەسەر ئەوە لێم نەدەڕەنجان. دەیانزانی لەشـم ئەسـپێ دروسـت دەکـاو، شـتێکی سروشتیە ئەسپێش نابەسترێتەوە، دانیان بەوە دانابوو. کاتێ بێکار دەبوون لە دەورم کۆدەبوونـەوەو پیپیـان دەکێشـاو لەگەڵکوو بچووکترین جـموجۆلْیـان لـێدەدیم دەوروووژانو دەسـتیان لـە چـۆکیان رادەکێشـاو جارجـاریش دانەیـەکیان شوولەدارێکی پێ بوو و، ئەو جێگایەی حەزم دەکرد دەیخوراند.

ئەگەر ئەمڕۆ دوبارە بۆ سەفەرێکی ئاوا بانگـهێشتنم بکەنـەوە قسـەی تێـدا نیـە ناچـم، بـەلام ئـەوەش بلْـێم هـەر بیرەوەری ناخۆش نین یادی ئەو رۆژانەم خەنەوە.

ئەو ئارامیـەی لـەنێو ئـەوان دا بەدەسـتم هێنـا، بـوو بـەهۆی ئـەوە دالّغـەی راکـردن لـە مێشکم بێنمـەدەر. رێگـەی خۆڕزگارکردنم لەهەلاّتن دا نەدەدی. دیارە بۆئەوەی زیندوو بمێنمەوە دەبوو رێگای رزگار بوون بدۆزمەوە. لەراستـیدا دەرفەتی راکردن بۆ مەیموونێك هەر نەدەڕەخسا.

ئەمڕۆ ددانەکانم خراپ بوونو، ئەگەر بمهەوێ نارگیلێك بشکێنم دەبێ زۆر لەسەرەخۆ وردە وردە ئەو کارە بکەم. بەلاّم ئەو کاتە ددانەکانم ساغ و تیژ بوون و دەمتوانی قفلّی قەفەسەکە بـبڕم، کەچـی ئـەوکارەم نـەکرد. ئـەو کارەشـم کردبـا چـی بـۆ مـن تێـدابوو؟ ئەوپـەڕی دەهاتمـە دەرو، ئێسـتا سـەرم لـە قەفەسـەکە دەرنـەدێنا دەیانگرتمـەوەو، لـە قەفەسێکی خراپترو تەنگتریان دەکردم. یان ئەگـەر کـەس هەسـتی بـە هـەلاّتنم نـەکردبا رووم لـە قەفەسـی حەیوانـە دڕندەو مارە ژاردارەکان دەکرد کە قەفەسیان بەرامبەر قەفەسـەکەم بـووو، دەبـوو دوایـین هەناسـەکان لـەنێو باوەشـی ئەوان دا هەلّکێشم. لەوانەش بوو بتوانم خۆبگەیەنمـە قـەراغ کەشـتیەکەو لـەوێوە خـۆ فڕێدەمـە نێـو ئـاوی دەریـاوە. ئەوکاتە ماوەیەك لەنێو دەریای پانو بەریندا سەرگەردان دەبووموو پـاش پەلـەقاژە نقـووم دەبـووم. ئەوانـە هـەموویان هەولّی بێئاکام بوون. من بارودۆخەکەم وەك مرۆڤێك هەلّنەدەسەنگاند، بەلاّم لـەژێر کاریگـەری بارودۆخەکـەدا بـووم و، دەتگوت هەلّمسەنگاندوە.

لە رووی عەقلّو مەنتیقەوە بیرم نەدەکردەوە، بەلاّم بەوپەڕی ئارامیەوە لەژێر کاریگەری ئینسانەکانی دەوروبـەرم دابووم. ئەو مرۆڤانەم دەدی کەدایمە لەهاتوچۆ دابوون. روخسارو جموجۆلّیان هەردەم کە بەبەر چاوم دا تێدەپـەڕین، پێم وابوو کەسایەتی هەموویان لە یەکێکیان دا کۆبۆتەوە. ئەوان سەربەست بوون لەوەی بۆ هەرکوێ بچن و، هەرچـی پێیان خۆشبا دەیانکرد. لێرەوەبوو رووناکی ئامانجێکی پیرۆز بەزەینم داهات. ئەگەر بەلّێنم پـێدابـان کـە وەك ئـەوان دەبم. کەس بەلّینی ئەوەی نەدەدا دەرگای زیندانم لـێبکاتەوە، مرۆڤی عاقلّ لە بەرامبەر کارێـك دا کـە نـاکرێ بـەلّێن نادا. بەلاّم کاتێ کارەکە بکرێ سەدان بەلّێن رووت تێدەکەن. ئەو بەلّێنانەی پێشتر بێهودە بـەدوایان دا دەگـەڕای. ئـەو خەلّکە سەرنجم راناکێشـن. ئەگـەر مـن لایـەنگری ئـەو ئازادیـە دەبـووم کـە بـۆم بـاس کـردن، بێشـك رێگـەی دەریـای بێسنوورم پێباشـتر بـوو لـە نێوچـاوانی تـاریکی ئـەوان. هەرچـۆنێکی بـێ زۆر پـێش ئـەوەی بـیر لەوشـتانە بکەمـەوە ئەوانەم لەبەر چاو بـوونو، لەراسـتیدا کۆمەلّـەی ئـەو تێڕوانینانـەبوو منـی بـەرەو ئـەو رێگەیـە هێنـا کـە ئەمڕۆکـە تێیدام.

لاسایی کردنەوەو شت فێر بوون لەو خەلّکە گەلـێ ئاسان بـوو. هـەر لـە یەکـەم رۆژەکانـدا فێـری شـەڕە تـف بـووم، تەنیا لە شتێك دا جیاواز بووین ئەمن پاش شەڕە تفەکە دەموچـاوم دەلێسـتەوە ئـەوان ئاوایـان نـەدەکرد. ئەوەنـدەی پێنەچوو پیپم وەك پیرەپیاوێك دەکێشا. کاتێ پەنجەی گەورەم لەسەر سەری پیپەکە دادەنـا خۆشـیو شـادی دەکەوتـە نێوخەلّکەکەوەو، تا پاش ماوەیەك هەستم نەدەکرد پیپەکە توتنی تێدا نیە.

زۆر بەبوتلّی عەرەقەوە مانـدوو بووم، بۆنەکەی زۆری ئازار دەدام. چەندین حەوتوو رابورد هەتا راهاتم. سەیر بوو ئەوکێشە دەرونیـەی منیـان لـە هـەموو شـتێك پـێ خۆشـتر بـوو. لـەنێو ئـەو خەلّکـەدا تەنانـەت لـە بیرەوەریشـم دا چ جیاوازێکیان تێدا بەدی ناکەم. یەکیان تێدابوو جارجار، تەنیا یان لەگەلّ نەفەرێکی دیکە لەکات و بێکاتی دا دەهـات شووشـەیەکی بەدەسـتەوە بـووو، فێـری دەکـردم. لـە هەلّسوکەوتم تێنەدەگەیشت و هـەولّی دەدا لـە نـەهێنی دەروونم تێبگا. سەرە دارەکەی بوتلّەکەی بە سەبری دەردەهێنا، پاشان لێم ورد دەبۆوە بۆ ئـەوەی بزانـێ تێگەیشتووم یـان نـا. دان بەوەدا دەنێم وا بەوردی سەیرم دەکرد کە هیچ مامۆستایەکی سەر ئەم گۆی زەویە فوتابیەکی وەك منی نـەبووە. پاش ئـەوەی سـەری شووشـەکەی لادەبـرد بوتلّەکـەی بـەرز دەکـردەوەو، بـەرەو دەمـی دەبـرد. نیگـام هـەتا گـەروی دوا دەخست. سەری رەزامەندی دەلەقاندو، لێم رازی بوو کە بەگوێ بووم. بوتلّەکەی بە دەمیەوە دەناو، منیش لە خۆشـی ئـەو ناسـینە لەسـەرخۆیە دەمقیژانـدو هـاوارم دەکـردو، هـەر جێگـەیـەکی لەشـم بەردەسـتم کـەوتبا هـەلّم دەکرانـدو دەمخوراند. زۆری پێخۆش بوو شووشـەکەی بەلێویـەوە دەنـاو قـومێکی دەخـواردەوە. بێسـەبرو هیـوابڕاو دەبـووم بـۆ ئـەوەی لاسایی بکەمـەوە قەفەسـەکەم پـیس دەکـرد، بـە بینینـی ئـەم دیمەنـە سەرخۆشـتر دەبـوو. لێـرەدا بوتلّەکـەی بەتەواوی لەخۆی دووور رادەگرتو، بەحەرەکەتێکی کەوانی لەلێوی نزیك دەکردەوە لەکاتێکدا ئەوەی بۆ تێگەیانـدنی من بوو بە شێوەیەکی زەقو ناشیرن خۆی بەپشتەوەدا دەشکاندەوەو، شووشەکەی بە تینگیـەوە دەنـا. مانـدوو دەبـووم هەسـتم بـەبێهیزی دەکـردو نەمـدەتوانی دوای ئـەو خۆپێشـاندانەی بکـەوم بـە میلـەی قەفەسـەکەوە هەلّداوەسـرام. ئەویش دەستی بەزگی دادێناو نزگەرەی دەدان بەم شێوەیە کۆتایی بە وانە وتنەوە تیوریەکەی دێنا.

پاش ئەوانە راهێنانی عەمەلی دەست پێدەكا. بەڵام بەرادەی پێویست بە وانە نەزەریەكەی داهێزرابووم؛ ئەوە بەشێك لە چارەنووسی من بوو. سەرەڕای ئەوەش بە هەموو هێزمەوە دەستم بۆ بوتڵەكە درێژ دەكرد كە بۆی راگرتبووم وەریبگرم. سەرەدارەكەم بە لەرز لەرز دەرهێنا لەو هەنگاوە سەركەوتم. هیزێكی زۆرترم كۆكردەوەو ورەم پێبەخشرا، بوتڵەكەم بەرز كردەوە، لاساییكردنەوەكەم جیاوازیەكی ئەوتۆی لەگەڵ ئەسڵیەكەی دا نەبوو. ئەگەرچی بوتڵەكە بەتاڵە بۆنی دێ بە بێزراویەوە فڕێی دەدەم ـ مامۆستاكەش ئەوەی زۆر پێناخۆشە ـ و، لەبیرم دەچێتەوە دەست بە زگم دا بێنم و، نزگەرە بدەم.

ئەو وانەیە زۆر جار دووپاتە بۆوە. لە پێوەندی دەگەڵ پێداهەڵگوتنی مامۆستاكەم دا دەبێ بڵێم: قەت لێم تووڕەنەدەبوو. دیارەجارجار پیپە داگیرساوەكەی ئەوەندە لەو جێگایەی دەستم نەیدەگەیشتێ نزیك دەكردەوە هەتا بۆن كروز لە لەشم هەڵدەستاو دەیسووتاند؛ بەڵام بۆخۆی بە دەستە گەورەو دڵسۆزەكانی دەیكوژاندەوە؛ لێم تووڕەنەدەبوو چونكە هەردووكمان لە بەرەیەكدا دژی سروشتی مەیموونیم شەڕمان دەكردو، لەو نێوەدا ئەركی من قورستر بوو.

شەوێك ـ وا بزانم لە جێژنێك دا؛ دەنگی گرامافۆن دەهات؛ و، ئەفسەرێكی لاو لەنێو خەڵكەكەدا دەگەڕا ـ سەركەوتنێكی گەورەمان وەدەست هێنا. ئەو شەوە خەڵكێكی زۆر كۆببووبوونەوە. كەس ئاگای لە من نەبوو. بەهەڵكەوت بووتڵە عەرەقیان لە نزیك قەفەسەكە دانابوو هەڵمگرت. خەڵكەكە كاتێ ئەوەیان زانی یەك یەك و دوودوو روویان تێكردم و سەرنجیانم راكێشا. سەرەدارەكەم دەرهێنا ئەو نیگایانەی تێمەوە رامابوون سەدان بژیان تێدابوو. بوتڵەكەم لە دەمم نزیك كرەوەو، بێوەستان وبێئەوەی خۆم تێك بدەم وەك عارەق خۆرێكی شارەزا بە چاوی خومارو گەرویەكی پڕ لەعارەق وەك پیاوان بوتڵەكەم بەتاڵ كرد. پاشان بوتڵەكەم لەبەر شپرزیو سەرلێشێواویەوە نا، بەڵكو زۆر هونەرمەندانە تووڕ دا، دیارە ئەم جارەش لەبیرم چوو دەست بە زگم دابێنم. بەڵام لەجیاتی، چونكە چارەیەكی دیكەم نەبوو، چونكە پێم خۆش بوو و، خەریك بوو سەرخۆش دەبووم، كورت و كرمانجی بە زمانی ئینسانان هاوارم كرد:"هۆریا" و بە هاوارەوە خۆم فڕێدایە نێو خەڵكەكەو زایڵەی دەنگیان:"گوێ بگرن خەریكە قسان دەكا!" وەك ماچێك لەسەر جەستەی شەڵاڵی عارەقم هەست پێدەكرد.

دوبارەی دەكەمەوە: لاسای كردنەوەی ئینسانەكان سرنجی رانەدەكێشام؛ لاسایم دەكردەوە چونكە بەشوێن رێگەی دەرباز بوون دا بووم، نەك بە هۆیەكی دیكەوە. ئەو سەركەوتنەش دەردێكی دەرمان نەكرد. دەنگی ئینسانیم دوبارە خنكێنرا؛ مانگەكان رابوردن هەتا هاتمەوە سەرخۆو توانیم وەقسە بێمەوە. بەڵام بیێزاریم لە عەرەق هەر نەبڕابۆوەو زیاتر بووبوو. چ دەكرا چارەنووس دیاری كرابوو.

كاتێ لە هامبورگ دایانمە یەكەمین راهێنەرم هەر زوو هەستم كرد دوو رێگەم لەبەرن. باخچەی ئاژەڵان یان شانۆ كردن. خۆم تووشی دوودڵیو دڵەخورپە نەكرد، لە دڵی خۆمدا گووتم:"هەموو تواناو هێزت بەكار بێنە بۆ گەیشتن بە شانۆ. ئەوەیە رێگای دەرباز بوون. باخچەی ئاژەڵان تەنیا قەفەسەكەی نوێیە. ئەگەر بێت و لاقت بچێتە ئەودیوی تێدا دەچی."

بەرێزان ئەزموونم دەست كەوت. كاتێ ناچار بی ئەزمونت دەست دەكەوێ. كاتێ دوای رێگەی رزگار بوون بكەوی بە هەر نرخێك بێ فێر دەبی؛ بە قامچی دەبیتە پارێزگاری خۆت، گۆشتی لەشت بە خۆڕاگری لە بەرامبەر شەلاق دا تیكە تیكە دەكەی. بەڵێ سروشتی مەیموونیم وایلێكردم رابكەم. مامۆستای یەكەمم چی وای نەمابوو بۆخۆی ببێتە مەیموون؛ هەرزوو وازی لە راهێنانم هێناو، رەوانەی شێت خانە كرا بە خۆشیەوە ئەوەندەی پێنەچوو ئیزنیان دا.

من زۆر مامۆستام هەبوون، جاری واهەبوو لەیەك كاتدا لەچەند مامۆستا كەڵكم وەردەگرت. كاتێ لەتواناییەكانم زۆرتر دڵنیا بووم. كاتێ هەستم پێكرد خەڵك سرنجیان بۆ لای پێشكەوتنەكانم راكێشراوەو، دواڕۆژێكی پڕشنگدارم لەبەر دەمە، بۆخۆم مامۆستام گرت. پێم دەگوتن لە پێنج هۆدە دانیشن بێ پسانەوە دەچوومە لای هەمووان و شتیان لێفێر دەبووم.

زۆر شت فێر بووم‌و پێشكەوتنێكی گەلێ باشم دەست كەوت. تیشكی زانست بە هەموو كون و سووچێكدا دەچووە نێومێشكی بەرەو لەخەو هەڵستانم. حاشا ناكەم. شایم لە دڵدا دەگەڕا، بەڵام دەبێدان بەوەشدا بنێم. ئەوكاتەش نرخێكی ئەوتۆم بۆ ئەو پێشكەوتنانەم دانەدەنا چ بگا بە ئەمڕۆ. خێرو بەرەكەتی ئەو هەڵەی كە هەتاوەكوو ئێستا لە دنیادا وێنەی نەبووە ئەوە بوو توانیومە بگەمە رادەی فەرهەنگی ئوروپایەكی مام ناوەندی. لەوانەیە ئەوە

شتێكی وانەبێ، بەڵام لەلایەنێكەوە گرنگی خۆشی هەیە. هەر ئەوە بوو بە هۆی ئەوە یاریدەی دام و لە قەفەس رامكرد. ئەو رێگەیە رێگەیەكی تایبەتی بوو. هەر ئەو رێگەی رزگار بوونەش بوو رێگەی مرۆڤ بوونی بۆ خولقاندم. لە زمانی ئەڵمانیدا وتەیەكی بەناوبانگ هەیە دەڵێ:"چووە نێو دەوەنان و بۆی دەرچوو." ئەوە كارێك بوو من كردم چوومە نێو دارودەوەن و بۆی دەرچووم. رێگەیەكی دیكەم نەبوو جیا لە راكردن. دیارە چونكە ئیمكانی هەڵبژاردنی ئازادیم نەبوو.

كاتێ سەیری ئەو گۆڕانكاریە، ئەوەی لەو رێگەیەدا دەستم كەوت دەكەم جێگەی گلەیی نیە. ئەگەرچی، جێگەی رەزامەندیش نیە. دەستم لە گیفانی پانتۆڵەكە ناوە، بووتڵی شەراب لەسەر مێزەكەمە لەنێو سەندەڵیە قووڵەكە كەلەبێشكە دەچێ پان بوومەوەو لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوە دەكەم. بەڕێوەبەری شانۆی پرۆژەكانم لە دیوی بەڕێوەبەری دانیشتوە. كاتێ زەنگی بۆ لێدەدەم دێو گوێ بۆ قسەكانم رادەگرێ. بەگشتی هەموو شەو بەرنامەم هەیەو پێم وانیە سەركەوتنێكی گەورەتر لەوەی بەدەستم هێناوە بەدەست بێنم. شەوانە كاتێك درەنگانێك لەمیوانی، كۆڕە زانستی یان كۆڕی هاوڕێو برادەران دەگەڕێمەوە ماڵێ، خانمە شامپانزەیەكی وردیلەو راهێنراو چاو لەڕێ دەبینمو، لە پەنایدا وەك مەیموونەكان رادەبوێرم. رۆژانە لێی بێزارم، چونكە نیگای شێتانەی حەیوانێكی سەرلێشێواوی هەیە، كە چاك رانەهێنراوە؛ ئەوەش تەنیا من لێی تێدەگەم و بەنۆرەی خۆم لێشی بێزارم. بەگشتی ئەگەر سەیری رابردوو بكەین هەرچۆنێكی بێ ئەوەی ویستوومە پێیگەیشتووم. نابێ بڵێین ئەوەندە ناهێنێ. ئەوەش بڵێم قەزاوەتی هیچ مرۆڤێكم ناوێ. تەنیا دەمهەوێ دۆزینەوەكانم بە گوێی خەڵك بگەیەنم. بەشدارە بەڕێز و بڵندپایەكانی ئاكادیمی ئەوەش تەنیا راپۆرتێك بوو پێشكەشم كردن.